

# ئوشا

هۆشەنگ شێخ محەمەد

کۆی شعرەکان 1996- 2006



*Hoseng Shexmihemed*

# *Usha*



# ئۆشـــا

## کۆی بەرهەمەکانی

## هۆشەنگ شێخمحەمەد

2006 –1996

Hoshang72@yahoo.com
کوردستان / شەقلاوە

2006

**پێشکەشە بە پارچەکانی گیان ،**

**بەرهەمی خەون و خولیا و خەیاڵ و ئازادی و**

**گوناه و حەزەکانی من و تریفە،**



**ئەرژەنگ و نێرڤانا**

www.dengekan.com
12/8/2006

# له روناهی ئوشادا

ئەمڕۆ لە نێوەندی ئەدەبی کوردی و بە تایبەت لە ئاستی شیعردا دەنگی تازە و شەلاڵ بە ئاوی جاویدانی داهێنان و هاواری لە بن نەهاتووی تازەگەریدا سەریهەڵداوە، کە ئەمەش ئەگەر ترۆپکی هەوڵەکانی داهێنەر نەبێت ئەوە بە دڵنیاییەوە دەڵێم شارەگ و شاهێزی تەکان و بڕستییەتی لە پێناو هاتنە کایەوەی شیعرێکی پڕ لە درەوشانەوەی گەوهەری کوردی،

ئەم کۆمەڵە شیعرەی شاعیر هۆشەنگ شێخمحەمەد کە کۆی ماوەیێکی دیاریکراوی داڕشتنی هەست و هەڵکفکانی ناوەوەی خۆیەتی و گوزارشت لە ئەوپەڕی راستگۆیی و عەشق و مەعریفەی خۆی دەکات، گەواهی سەرهەڵدانی وەچەیێکی تازەی شیعری چاك دەکات، من ماوەیەکی کەم نییە شیعرەکانی ئەم شاعیرە دەخوێنمەوە کە رۆحی هەڵگری ئەستەتیکا و نوژەنی و سیحری تیا دا دەبینم، ئەمە و جگە لەوەی کە هۆشەنگ شیعرەکانی خۆی بە چەمکەکانی رۆشنبیریی تازە و زمانێکی تۆکمە و ئایدیای موژدەبەخشی هاوچەرخییێتی رەباز کردوە، کە ئەمەش وایکردوە جۆرێك لە سروتی جاویدانی بۆ هەناسەکانی خۆی بخولقێنێ،

شیعر لە ئەمڕۆکەدا ریتمی خۆی گۆڕیوە و بەرەو ئاقارێکی دیکە چووە چ لە رووی فۆرمەلەکردنی دیدگاوە بێت چ لە رووی رەنگرێژی ناوەڕۆکەوە بێت، هۆشەنگی شاعیریش بە نێو ئەم هەڵڕژانەدا قەراری گرتووە و تا رادەیێکی زۆریش توانیویەتی سود لە ریتمی شێوەزاری دیکە وەربگرێت کە وایکردووە شیعرەکانی بە بیرۆکەی رەنگاورەنگ دەوڵەمەند بکات.

هەندێ جار لە نێو شیعرەکاندا ریتمی پەخشان وەك رێچکەیەکی زاڵ خۆی دەنوێنێ بەلاَم هەمدیس شیعرییەت خۆی بەسەر دا دەچەسپێنێ و ئاوی تەك وێنەیی و مۆنادی جوانی پێ دەبەخشێ، ئەوەی زیاتر هێزی شیعرییەت و خولقان دەبەخشێ بە شیعرەکانی هۆشەنگ ئەو ئازادی و رەهاییە کە لەفەزای شیعرەکانی دا بەدی دەکرێت، کەوای کردووە نەرمی و چێژێکی زۆر ببەخشێ بە شیعرەکانی، دواجار ئەوە ماوە بڵێم کە هۆشەنگی شاعیر سنووری هەندێ تابۆ دەشکێنێ و خۆی لە قەرەی بابەتی شاراوە و دوورە دەست دەدات، گرنگ ئەوەیە ئەو بابەت دەخولقێنێ و کۆماری شیعری پێ ئاوەدان دەکاتەوە.

کەریم دەشتی

هەولێر2006/11/15

www.dengekan.com
12/8/2006

# کۆمەڵەی یەکەم

# نێـرڤانا



www.dengekan.com
12/8/2006

**خەون کفری نووستنە**
**شیعر کفری تێڕامانە**
**لەزەت کفری جەستەیە**
**باران کفری ساتە سەر مەستەکانی ئاسمانە**
**سەراب کفری دەمە بێئاگاکانی بیابانە**
**سەما کفری بادەیە**
**فڕین کفری تەمەنە**
**سێو کفری رۆحە**
**عشق کفری من و تۆیە**
**من و توش کفری ئەم شارەین**

**( کفری من)**

**لەو تەمەنە زەیتوونییە**
**گەر بەو سێبەرەی کفرە نەبێت**
**ئێوارانی رۆحم بەکێ بسپێرم؟!**
**گەر بەو بەهارەی کفرە نەبێت نیوەڕۆیانی**
**باخچەی سەرم بخەمە چ لەپێکەوە؟**
**گەر بەو شەوەی کفرە نەبێت**
**جریوەی ئەو پەیڤانە لەسەر تەختەی رەشیکوێ بنووسم؟**
**( هەموو شتێکی رەشم خۆشئەوێ )**
**ئێستاکە من**

www.dengekan.com
12/8/2006

**( جلی رەش و**
**چاوی رەش و**
**پێستی رەش و**
**دڵی رەش و**
**رۆژی رەش و**
**تەنانەت چارەی رەشیشم**
**خۆشــدەوێن )**

**(کفری من و تۆ)**

**من و تۆ بەم کفرەوە جوانین**
**بەم عەشقە بێمەبەستەوە قەشەنگین**
**من وتۆ کفری ئەم شارەین**
**ئەو شارەی ئاگایی لە نێو لاپەڕەکانی بەرنامەی ئێزگەیەکی ناوخۆییەوە**
**لە بڕگەکانی پەندو مەتەڵەوە دەخەوێنێ**
**ئەو شارەی فرچکی بە کوچەکانی خەتاو شەقامەکانی سەلەفییەت گرتووە**
**ئەو شارەی مناڵییێتی لەتریقەی ئەم کفرە دەپارێزێ**
**ئەو کفرە قەقنەسییەی گاڵتە بەچارەنووسی ئاماژەو نهێنییەکانی کانی**
**حەکیمە گێلەکانی شار دەکا**
**من و تۆ بەو کفرە ساکارەوە رەنگاوڕەنگترین زەخرەفەی بەرگی ئایەتەکانی**
**ئەم شارەین**
**ئەو شارەی لە نێوان سێوو ئادەمدا قولانجێ بۆشایی هەبوو**
**بەخوێن پری کردەوە**
**ئەو شارەی لەنێوان ئاژەڵ و ئادەمدا بستێ بۆشایی هەبوو**

www.dengekan.com
12/8/2006

بەخوێن پڕی کردەوە
ئەو شارەی نێوان وەرزەکانی ساڵی بەخوێن پڕکردەوە
ئەو شارەی نێوان هێلانەی سقۆرەکانی پڕ لەگوێزی خوێن کرد
ئەو شارەی تخوبی باخچەکانی پڕ لەگۆزەی خوێن کرد
بۆشایی نێوان گوڵ و پەپوولە خەندەیەك بوو.. کردیان بە هکتارێك گریان
دووری مانگ و دەریا شەپۆڵ بوو کردیان بە چەندین ساڵی تریفەیی
دووری نێوان کۆترو ئەشکەوت گمینێ بوو هەزارەها میلی گومانیان تێدا رژاند
دووری نێوان مامزێك و پڵنگێك دار زەیتوونێ بوو عومری سەد پاییزیان تیادا موتوربە کرد
بۆشایی باخچەو تەیرەکان هەنجیرێ بوو چەندین ماری سەربەهەشیان بۆ راگرتن
ئەو شارە !
ئەو شارەی نێوان خۆی و خوا نوێژێ بوو بە ئۆقیانووسەکانی خوێن پڕی کردەوە
ئەو شارەی نێوان زەردەشت و ئاڤێستا ئاگرێ بوو بە دۆزەخێك پڕی کردەوە
ئەو شارەی نێوان عیسا وئینجیل وەفایێ بوو بە خاچێك پڕی کردەوە
ئەو شارەی نێوان شەراب و ترێ گوشینێ بوو ئاینێکی خستنە نێوان
ئەو شارە.. ئای لەو شارە !
گەر نێوانی من و تۆش کفرێ نەبێ لەئیمانی نێوان باڵ و فڕین یەقینتر بێ
ئەوا کەنارییەکانمان دەبەنەوە جەنگەڵ.. پەیڤەکانمان دەدەنەوە یەزدان بەتاڵمان دەکەنەوە لەو کفرە..
ئەو کفرە نارنجیەی حەقیقەتەکان پرتەقاڵی دەکاتەوە
ئەو کفرە سەرابییەی شکۆیەك بە وشکایی بیابانی فەنا دەسپێرێ

www.dengekan.com
12/8/2006

**ئەو كفرە پیرۆزەی پوشێكێ قودسییەت بەلانەی پەرسێلكەكانی ئاماژە رەنگینەكان دەداتەوە**
**ئەو كفرەی لەئاست سادییەتی باوكەكانی سیاسەت و ماسۆشییەتی ژنەكانی سیاسەتدا یاخییە ..**
**ئەو كفرە گەیشتۆتە قەناعەتێك..بوون گوناهێكی گەنمرەنگییە دەبێ بە رۆشنایی ئەو ماهییەتە مانایەك بەبوون .. بە جەستە.. بەسۆزی دڵ، ببەخشین**
**ئەی كفری ئەو شارەی هەموو ساتێ لەماڵەكانیدا..لە باخچەكانیدا..لە مزگەوت و مەیخانەو كتێبخانیدا**
**تەرِوادەیەك لەسەر ژنەكانی دەسەلآت روودەدا**
**بۆ ئەم شارە جنێوێك بەسە**
**چركەیەك بەسە بۆ ئەوەی شەرِێكی سەد ساڵی بەرپابكەن**
**چركەیەك بەسە چەندین سەدە بەرگی گوڵە یاسەمینەكانی بوونمان هەڵوەرێنن**
**چركەیەك بەسە هەزاران ساڵ كەناریەكانی حەقیقەت تەریوكەن و دەریا لە نەورەسەكانی وەفا بكەنە جەنگەڵ**
**چركەیەك بەسە بۆ ئەوەی تا ئەزەل بەوەرزی خیانەتدا بفرِن**
**چركەیەك بەسە سەبەتەی خەونەكانمان بەتاڵكاتەوە لە سێوو عەشق و فرِین**
**چركەیەك بەسە میحرابەكان خاڵیكاتەوە لەنور**
**چركەیەك بەسە ژنەكانمان خاڵیكا لەمەمك**
**چركەیەك بەسە بۆ مردن.. بۆ عەدەم**

**ئەی جوانترین كفری زەمین!**
**بەر لەو چركەیە لەدەرگەی باخچەی سەری ئەم شارەدا.. وا دەتنووسمەوە :**
**( گەر بەئاوی كفر نەبێت .. دار مێوەكانی حەقیقەت ترێ ناگرن**

www.dengekan.com
12/8/2006

**گەر بەتاڵی کفر نەبێت .. هەڵوژەکانی هزر بەچی دەگەنە ئاسمانی تێڕامان؟**
**گەر کێشانی کفر نەبێت .. سێوەکانی عەشق چۆن دەڕژێنە سەبەتەی خەیاڵەوە؟**

**( شەڕاب کفریترێیە! )**
**ئەمەیە جوانترین کفری باخچەکان**
**من وادەڵێم و تۆش وەرە نەخشێك لە زەخرەفەی ئەم کفرەوە بگرەوە..**
**ئەی باخەوان**

**بەر لەو چرکەیە دوا حیکمەتنامەی کفرە جوانەکان لە گۆڕستانەکەی ئەم شارەدا دەنووسمەوە :**
**وەرە هاوڕێ با پاساری نهێنیەك لە بن گوێتا بەڕەڵلا کەم**
**( دڵبەرترین گۆڕ گۆڕی سەربازی ونە )**
**ئەم دار بەڕوە بە عومرانە هێشتانەکە ساوان لە تێگەیشتنی نەخشی بازنەکانی دەستی فەنا**
**من زەیتونێکت دەدەمێ بتوانێ ڕەنگی بێدەنگی گۆڕستانەکان بگرێ**
**سنەوبەرێکت پێدەبەخشم وەرزەکانی حەقیقەتی مەرگت بۆ بخوێنێتەوە هاوڕێم**
**( مردوو کفری گۆڕستانە ! )**
**ئەمەیە جوانترین کفری فەنا..**
**مردوو بۆ گۆڕستان وەك کوریکە ئەوەڵ بەهارییەکانە بۆ باخچە**
**مردن خەتایەکە وەك جەستە جوان**
**کفرێکە ئارام و بێدەنگ**
**لەژێر باڵی سێبەری سنەوبەرو عومری زەیتونەکان کپ دەکەوێ**
**ئەی تۆی بە من ئاشنا**

www.dengekan.com
12/8/2006

( ئەگەر ویستت بمبینی .. با گۆڕستان جێی ژوانمان بێت
مادامەکێ گۆڕی سەربازی ونمان نیە .. لەلای گۆڕی یەکێك لەدەیان عاشقی
ئەم شارەوە
چاوەڕێمکە ! )
من وادەڵێم و تۆش وەرە
چڵێك لەدار زەیتوونی ئەم کفرەوە بشکێنەوە
ئەی گۆڕهەڵکەن !

www.dengekan.com
12/8/2006

# تاناتۆس

ئابی 1999 دهۆك



نیگارڤانە بریندارەکە بەو خوێنەی لەپەنچەکانتەوە فیچقە دەکات
پۆرترێتێکی خوێناویم بۆچێکە
لەم دۆزەخەی عەشقی جەنگەڵ
روحی بریندار ی عاشق ئەڵێت:
( یوسف لە خۆشبەختی ئێوارەیەکی دوورا
رووتت دەکاتەوە..)
تۆ بەو پەنجە رووشاوانەت خۆشترین ئاوازی جەنائزیم بۆ بژەنە
ئەمە هەرگیز خەیاڵ نیە .. بەشێکە لە تراژیدیاو کەرنەڤاڵی خۆکوشتنم
(یوسف) بەهەشتییەو (زولەیخاش) بۆپەرتبوونی جەستەی
پ ر

www.dengekan.com
12/8/2006

ت ه

دەبێت ..!
لێوی ئەو لەڕوومەتی تۆ نزیکترە لە لەززەت لە ماچکردنا
چاوی ئەو لەخونچەی دەمی تۆن زیکترە لەگەشانەوە لە پشکوتنا
ئیتر ئەو خۆی خوایە گەورەم !
بۆ دوا جار بێعەشق دەبیت.. ئەی عاشق !
( تاناتۆس ) لەپشت دەریاکانەوە
وەك هەورێکی تەڕ هەڵدەکا
لەم شعرە ئەسمەرەمدا ڕەشتاڵەترین پەیڤ دەشواتەوە
ئیدی دوور لەدۆزەخەکانی حەقیقەت ..بۆ دوا جار غەریب دەبیت زولەیخا !
ئەمە هەرگیز خەیاڵ نیە .. مەرگێکم وەك سیگار بۆ هەڵکە!

بۆنی قاوەی لێدێت
تەنیایی ڕۆژانی ترس بە سەفەرو جووتبوون دەگۆڕێتەوە
( ئێرە خاکی تۆنیە
لێوی تۆ لەماچەکانی مندایە
مەمکەکانی تۆ لە لەپمایە)
وات پێدەڵێ و دەتبات!

پۆرترێتی پاکیزەییم بە ئاوو شیری مەمکەکانت بکێشە
ئەمە هەرگیز خەیاڵ نیە.. بێنازیی و جودێکە لە جەنگەڵ.

بێزاربوویت لە جەهەنەم..؟
بەشاتانەکانی ڕوحمت وت : خوشکی ئێوە نیم
بەکێڵگەکانی برینمت وت : گوڵەگەنمی ئێوە نیم

www.dengekan.com
12/8/2006

بەعەشقی جەنگەڵیانەی دۆزەخم : من کچی تۆ نیم..!
ئەمە هەرگیز خۆشنوودی کۆترە شینکەیەك نیە دوو دەنکە دانی دەدەیتێ..
خەیاڵیش نیە .. فەتوای کوشتنی بێنازییم بێت!

ئەی دڵبەرترین حەقیقەتی نێوزەوییەکانی گومان و چنارەکانی یەقین
سەیرکە ( تاناتۆس ) چەند لەو جووتیارە دەچێت..
کە بە گاڵتە کەمەندە گیاییەك بەبەر گایەکەوە دەکات و
گایەکەش بەڕاستی زەوی دەکێڵێ
سەیرکە تۆ چەند لەو گایە دەچیت..
بەگاڵتە زەوی دەکێڵێ و
رۆحی منیش بەڕاستی شەقار شەقار دەبێت؟!
سەیرکە چەند لەو خاکە دەچم بە گاڵتە شەقار شەقار دەبێ و
بەڕاستی لە تۆدا دەمرم؟!
ئەمە هەرگیز خەیاڵ نیە..
( عەشق تاریکترین ساتە!)
نێرگزی ئەو نهێنیە لە پرچت ببەستەکە لە جەهەنەم جیابوویتەوە
گەر لەبەهەشتی ( یوسفدا)
ویستت لەپەنچەرەی سپێدەیەکەوە سەحەری خۆشبەختی بگریت
لە بانێژەی شەوێکەوە تریفەی بەختەوەری کۆبکەیتەوە..
لە تولەرێی باخێکەوە گێلاسەکانی بەخشندەیی لێبکەیتەوە
بیرت نەچێت..عەشق تاریکترین ساتە!
ئەمە دوا نهێنییە پێی دەزانم بەر لەمردنم لە تۆدا
دەمرم و لەخۆمدا برینی لاسکە گوڵەگەنمەکانی جۆزەردانی دەبەستمەوە
دەمرم و لەخۆمدا پرچی شاتانەکانی جەنگەڵ بە
دەسماڵێك لە (با) دادەپۆشم

**دەمرم و لەخۆمدا گۆرانییەك بۆ جووتیارەکانی بەیارەکانی عەشق جێدەهێڵم**
**لە وەرزی دروێنەدا بیڵێنەوە**
**دەمرم و لەخۆمدا ئەوماڵە جێدێڵم..سپێدان تیایدا دەمدی**
**گوڵە گەنمێك قوڵنجی (با)ی دەشکاندەوە**
**ریحانێك پێڵاوەکانی کەناری دەکردنە پێ**
**بۆ پیاسەی باخچەکانی هەور دەچوو**
**دەنکە ترێیەك جگەرەیەکی مێوی بۆ پاسارییەك هەڵدەکرد**
**مامز و نێرگزێك دەچوون وێنەیەك پێکەوە بگرن**
**پڵنگێك بە پاڵتۆیەکی کاژەوە پاسەوانی پرچی دارستانی دەکرد**
**دار پرتەقاڵێك نامەیەکی بۆ ئنجانە نازنازێك دەنووسی**
**ئەستێرەیەك پۆرترێتی کانییەکی لەسەردار سپینداریك دەکێشا**
**سنەوبەرێك چاویلکەکەی دەخستە چاوی گزنگەوە**
**شالورەکان،تەنبوور ژەنێکی شەرمن بوون،ئاوازە خوێن**
**گەرمەکانی خۆیان لەبەر دەرگەی پەرژینەکان دەسووتاندن**
**هەنگێك،دەستەسڕە یاسەمینییەکەی دەکردە بەریاخەی و عاشقانە**
**بەرەو گەڕەکی گوڵەکان دەبوەوە**
**کچی دار خوخێك لەپەنجەرەی بەژنییەوە**
**کوریکەکانی دەهاوێشتە حەوشەی ماڵی کوڕە سمێل بابڕەکانی خوناو**
**دولفینێك مکیاجی لەسەدەفەکان دەدزی و لەتولەرێی**
**دەریاکانەوە بەدیاری دەیدانە نەورەسەکان**
**دارسێوێکی پیر بەدەم گەلاَ لە خۆداکوتانەوە**
**لە حەوشەی گەرازە بێوەژنەکانەوە دەردەکەوت**
**هەنجیرێك کولێرە و ماچی گەرمی بۆدار تووەکان دەنارد**
**پەپوولەیەك مەمکی هەنارێکی دەمژت و پەنجەکانی بەلاڕانی دێنان**
**هەرماسییێك لەرێی کانیدا لێوەکانی بەلێوی شاتووێك سوور دەکرد**

ئێستا من لە خەمی کاڵبوونەوەی مناڵیتام
لەخەمی بێ ئۆقرەی سنەوبەرەکانی ئارامیتام

نێرڤانا
کە دەڕۆیت ، روحی رەهام جێم دەهێڵی
باخچەیەك لەسەفەری گومان و
باخچەیەك لەسەفەری یەقین
بەدەم رێگاکانی حەقیقەتەوە دەچێنی

زۆر خۆش دەڕۆیت
دەستی سۆزانیم لەئارەقەی بەخشندەیی خواکانەوە پڕ دەکەی
بخورو چرایەك و نزایەك بۆ قەتماغەی ماچی لێوەکانم دادەگیرسێنی
نەسیمێکی کاڵ بۆ وەرزی خەتا گەنمڕەنگییەکانم بەجێدێڵی

خۆش دەڕۆیت
وەك ئەوەی هەورە یاخییەکان بۆ دەریا بێنازەکان ببەیتەوە
وەك ئەوەی نەورەسەکان بەدڵی ئاو بدەیتەوە
وەك ئەوەی سنەوبەرەکان بەپایزی باخچەکان و کۆترە
کێوییەکان بە ئێوارە بەهارییەکان بسپێرییەوە

وا جوان دەڕۆیت
وەك ئەوەی میحرابەکانی عەشق پڕکەیتەوە لەنووری ماچ
وەك ئەوەی جانتایێ ماچ بگەێنیە ئەو رێبوارەی
بەدوا کەشتی بۆ دوا دوورگەی بەهەشت ئەچێت

www.dengekan.com
12/8/2006

وەك ئەوەی دوا زمان بگەێنیە ئەو گۆرانیبێژەی
لەگەڵ دوا کەناری بۆ دوا کەرنەڤال ئەچێت
وەك ئەوەی چەپکێ وەنەوشە بدەیتە دەست ئەو شاعیرەی بۆ جەنگ ئەڕوات
وەك ئەوەی ئەلبومێ شیعر بگەێنیە ئەو ئاشقەی
بەرەو مەنفا ئەروات
وەك ئەوەی چەند رەنگێکی نوێ بۆ ئەو نیگارڤانە ببەی
کەتابلۆکانی فڕێدەداتە جەهەنەم

واخۆش دەڕۆیت
وەك ئەوەی وەرزی دیکەت پێبێ بۆ ئەو باخەوانانەی
بەرەو جەنگەڵ دەچن
وەك ئەوەی رەنگینترین سەرابت پێبێ بۆ ئەو
سارا نشینەی بەتوڕەیی بەرەو فەنا دەبووری
واجواندەڕۆیت
وەك ئەوەی مەرگێکی نوێت پێبێ
بۆ ئەو ( سیسیل ) ەی لەرەکەهی ئەبەدییەتدا دەگریێ!

من شەڕم لەگەل هەورە یاخییەکاندا بۆ گۆرانیەکی دەریایی بوو
من شەڕم لەهەموو باخچە کوێرەکاندا بۆ ولاٌتێکی وەنەوشەیی بوو
من شەڕم لەگەل بەهارە شەرمنەکاندا بۆ پیاسەییێکی ئێوارانە بوو
من شەڕم لەگەڵ خوابەنازەکان بۆ بێنازیی ئازادی بوو
من شەڕم لەگەل جەنگەڵە پرچ درێژەکان بۆ بەردانەوەی قژی روحم بوو
من شەڕم لەگەل حەرفە بێوەفاکان بۆ پەیڤێکی دۆست بوو
من شەڕم لەگەل یەقینە گومڕاکان بۆ گومانێکی ئەرخەوانی بوو
من شەڕم لەگەل رەنگە بەهەشتییەکان بۆ شەیتانە ژیکەلەکان بوو

www.dengekan.com
12/8/2006

من شەڕم لەگەل بەیداخە درۆزنەکان بۆ شکۆی جێژوانەکان بوو
من شەڕم لەگەل پیرۆزییەکاندا بۆ کفرە جوانەکان بوو
من شەڕم لەگەل وێستگە دڵڕەقەکاندا بۆ سەفەری خیانەتە دڵبەرەکان بوو
من شەڕم لەگەل تۆدا بۆ فەنابوون بوو لەخۆمدا!
من شەڕم لەگەل خۆمدا بۆ فەنابوونم بوو لە تۆدا!
عەشقم بە مەعریفەی کتێبی جەهەنەم خوێندەوە
من جەهەنەم بووم لە عەشق
عەشق تاریکترین ساتی من بوو!!

بڕۆ نێرڤانا
ئەی ماڵ و مەئوا رەشتاڵەکەم!
بڕۆ وەك ئەوەی بچیت گوێ لەگێڕانەوەی دواخەونی دارستانەکان بگریت
وەك ئەوەی سێبەرێ لەجەنگەڵ..بونێچیرڤانە بریندارەکان قەرزکەی
گۆرانییێ لە دەریا..بۆ ناخودا پیرەکان بخوازیت
تایەتێك لە گۆڕستان..بۆ گۆڕهەڵکەنە بیمارەکان بێنیەوە
بچیت بەدوای قەترەی حیلەیەك بگەڕێیت بۆ مەیتەرە کوێرەکان
بچیت پاڵتۆیێ لەباران بۆ پاسەوانانی بەر دەرگاکانی زستان بەڕاداندەیت
بچیت شوفێرێ بۆ وەرزە دوورەکانی ساڵ تێبگەیێنیت..

بڕۆو..خەزنەی ماچەکانم ئەمانەتی پاسەوانی لێوە تالأنکەرەکانت!
بڕۆو..گۆرانی پەنچەکانم ئەمانەتی رێگرە بێدەنگەکانی پرچت
بە پێڵاوەکانی مەرگ دەکەمە غار
دەرگەی ماڵەکەم کڵۆم دەدەم
ژوورەکەم بەشی مەرگم ناکات!
دارستانەکانی ( تاناتۆس ) لەباخچەی مەرگم گەورەتر نین.

www.dengekan.com
12/8/2006

**بڕۆ نێرڤانا بڕۆ**

**بڕۆ بەختەوەرم**

**کەدێیتەوەش..زۆر بەختەوەرتر..........!!**



www.dengekan.com
12/8/2006

# سۆراغی پەیڤە جەنگەڵییەکان

1997/10/16دهوك



www.dengekan.com
12/8/2006

پیربووین و لەوەرزەکانی عەشقا پیاسەیەکی ئێوارانەمان نەکرد
پیربووین و بەروحی ئەهریمەنیمان نەگەیشتینەوە جەنگەڵەکان
پیربووین لەم بیابانی مناڵێتی‌یەدا!
پیربووین و
کەسمان بە موژدەی خۆشنوودی ڤیانێکەوە سەرابێکی نەکردە چرا
پەیڤێکی رەشتاڵەمان لە شعرە رەشئەسمەرەکان نەخوێندەوە
تۆڵەی دارکاژە سووتاوەکانی ماچمان لەئاسۆی حەرامی لێوەکان نەکردەوە
پیربووین ... پیر
پەیڤەکانمان بۆ مەرگ جێدەمێنن لەشارێکی بێ گۆڕستاندا !
عەشقمان بۆ خەون جێدەمێنێ لەشۆستی‌یەکی بێ خەودا !
ئەسپەکانمان بۆشەڕ جێدەمێنن لەئاسۆیەکی بێ خاکدا !
حیکمەتەکانمان بۆسەفەر جێدەمێنن لە کەشتییەکی بێ دەریادا !
هەقایەتەکانمان بۆ شەوان جێدەمێنن لە داپیرەیەکی بێ نەوەدا
ئەی یار .. چەند غافل بووین
کە ویستمان .. بەرێنمایی ئەستێرە شەڕانگێزەکانەوە
بگەینەوە سەنگەرەکانی پێشەوەی عەشق ؟
چەند غافڵ بووین
کە گەرەکمان بوو بەم میدالیای شەڕەفانەوە
بگەینەوە مینبەرە پیرۆزەکانی مێژوو

www.dengekan.com
12/8/2006

**بەزمانی ئەشکەوتەکانەوە گوتارێ بخوێنین**

**چەند غافڵ بووین**

**هەموو باخچەکانمان تالأنکردن تەنیا باخچەی عەشق نەبێ !**

**هەموو وەرزەکانمان پڕوکاندن تەنیا وەرزی ماچ نەبێ !**

**پیربووین و غافڵ**

**لە عەشقی پەیڤ و ماچی زمان !**

**پیربووین و گومڕا لەپیری !!**

# مردن له تۆدا

1999/5/11 دهۆك



ئیدی زریان و رەشەبا و تۆفانەکان لەمنەوە هەڵناکەن
رەنگەکان لەمنەوە خەلاس
من ئومێدی گەمەیەك دوای مردنم دەکەم
کەناخودا خنکاوەکان و باخەوانە ما رانگەستەکان نەیانکرد
کە ئەو قەسابە هەتیوبازە نەیکرد، بەر لەمردنی لەسەر دەستی منداڵێکی چاوشیندا
کە ئەو شاعیرە کەئیبەش نەیکرد ، بەر لەخۆکوشتنیدا
ئەو کچە سنێلە عاشقەش نەیکرد کە  لەحەمامدا خۆی بە کۆمەڵێ خەونی حەرامەوە سووتاند
ئەو جەنگاوەرەش نەیکرد ، عەبەسیانە پێیەکانی خۆی لە سەنگەردا گرێدابوون
ئەو رێبوارەش نەیکرد ، کە بەقووڵی لەسەفەری نەڕوانی
ئەو باخچەیەش نەیکرد، بەر لەوەی رەنگەکانی لە وەرزێکی بێوەفادا بدۆڕێن
ئەو باڵندانەش نەیانکرد، کە لە مەوسمەکانی کۆچکردندا دەمردن

من ئومێدێك دەکەم.. کە رەشەبا و زریانەکان..کە رەنگەکان
کە تۆ..ئەی برادەرخان..نەتانکرد..بەر لەمردنمدا
( مردن..لەتەواوبوونی گۆرانیەکی خۆشدەچێت ! )
گەمەی مردن لە تۆ ، ئەمەیان خۆشترین گەمەی روحە
خۆشتر لە گەمەی خەیاڵی تۆ
لە گەمەی عەشقی تۆ
لە گەمەی سێکسی تۆ..

www.dengekan.com
12/8/2006

# گوناهە گەنم رەنگییەکان



www.dengekan.com
12/8/2006

**لەو سێبەرە گەرمەوە**
**لەپەنجە و هەناسەو سێبەرەکانتانەوە**
**وەك گوناهێکی گەنم رەنگی رژام**
**سەردارەکەم بۆچیت هێنام ؟**
**تابەقسەی شەیتانەکان**
**بخور بۆ میحرابە پەژمووردەکانی خوا داگیرسێنم؟**
**یان بەدوای سەروەرییەکانی ئایەتەکانی جەنگ بگەرێم؟**
**بۆچیت هێنام**
**تالەگوناهە گەنمڕەنکییەکانت دەوڵەمەند بیت؟**
**کەدەتهێنام بۆئارامی زەیتونەکانی سەر گوڕستانەکانت نەخستە باخەڵمەوە؟**
**بۆ رەنگی شالورێکت بە باخچەکانی دەنگم نەبەخشی؟**
**بۆ دڵنیایی دار هەنجیرەکانت بە تەیرەکانی هزرم نەدا؟**
**بوون..ئەی یاخیستان .. لەکوێوە رووت تێکەم؟**
**لەو کازێوەی تەپوتۆزی شەری تیا بڵند دەبێ**
**یا لەو خۆرنشینەی کوڕە چاو جوانەکەی خوا لە خاچ دەدرێ؟**
**ئەی بوون! تۆ فەرتەنەی نێوان من و خۆمی**
**یان خنوعی سەرخاچەکەی عیسا؟**
**دەشێ ئەی بوون .. لەگوناهێکی گەنمڕەنگی زیاتر نەبیت.**

www.dengekan.com
12/8/2006

ئافرەتێك بە رووتی نوێژ دەكا!
شەهیدێك ناوی خۆی لە لیستەی نەمراندا دەسرێتەوە
بایەكی فێگرتوو
كردنەوە لە دەروازەو پەنجەرەكان
تەلاّق دەدا!
ئیتر (( مەسیح )) نایێتە ژوور!
بە گیانی بریندارتان
لەكۆشی گۆرانی ئازارە شكۆدارەكان...
وەك رێبەندان لە ئامێزی بەفر
بمێننەوە
ئیتر سەماش شووشە حەبێكی
ئێكسپایەرە
گوڵە گەنمێك باسی خیانەتی باران دەكا
( لە خەزەڵوەری خەونی وڵاتدا
حەیاو چوونی سروشتمان بۆ مایەوە)
ئیتر بخوری وشە لە میحرابی شیعر مەسوتێنن!

www.dengekan.com
12/8/2006

بەخاتری ئەو تەمەنە زەیتوونییەی
گەلاٌ ئەرخەوانییەکانی باخچەکانی خۆرنشینی هەڵوەراندن
ئێوارە رووکەنەکانی مناڵییێتی لە کازێوەدا بەسەراب برد
بە خاتری ئەو نەفرەتەی لە گولاٌنی کێڵگەکاندا
ناونیشانی ولاٌتی رەنگی با ی لە باخەڵی گوڵە گەنمە چاورەشەکان دزی
بەخاتری ئەو وەنەوشە بەدبەختانەی لە مەعبەدە مۆرەکانەوە
موناجاتی کوڕە چاو جوانەکەی خوا ئەکەن
لە بانێژەی چامەیەکی چاو سەوزەوە
بانگی رەنگی عومری بێدەنگیم ئەکەم
لە خۆرنشینە پەمەییەکان کۆمکەرەوە،
هەڵمبگرە بۆکازێوە برۆنزییەکان
من لەتۆدا باخچەکانی بێدەنگیم رەنگ دەگرن
لە تۆدا تەمەنم..
لەتۆدا مەمارەسەی عومری درێژترین خەونم!

www.dengekan.com
12/8/2006

چيم له تۆ خوشتر بوێ
ئاوازی تەمبوورێکی قەرەجان
یا کێڵگە گەنمەکانی بەر خۆرنشین؟
وەرە .. لەپشت خەڵوەتگەکانی بوون
لە باخچەکانی یاخیبووندا .. لە روخ رووبارەکانی پشت شەڕگەکان..

بخورە وەنەوشەییەکانی مناڵی
بۆ موناجاتە خوێنگەرمەکانی هەرزەیی داگیرسێنین
چەند خۆشە بێمەبەست هاورێ بین ؟!
بێمەبەست یەکتریمان خۆش بوێ!
وەك ئەو شیعرە رەهایەی
لە پیاسە بێمەبەستەکانی وشە گەڕۆکەکان .. لە دایکدەبێ

www.dengekan.com
12/8/2006

لەدەنگێکی نەرمەوە
لەوەرزی ڕەشتاڵەی شیعرە بەنازەکان
بەدوای قەسیدە چاو ڕەشەکانی گوڵەگەنم
تریفە ڕەنگ ئەسمەرەکانی وەنەوشە،هاتم
لەحیلەی شیعرێکەوە .. ولاٚتێکی گەنمڕەنگیم ناسی
بەکازیوە خۆشبەختەکانی .. ئەو پەنچەرانەی لە بانێژەی هەتاوەوە
تاڵە بڕۆنزییەکانی سەفەری وشە و باڵە پەمەییەکانی پەپولانی خەون
بە دیوانە شیعرێك دەبەخشن ، هاتم
ئێستا لەدەربەندی ڕۆحی پاکزادە و هەوەسبازە دۆست زیزەکان
تارمایی گالیسکەوانە سەرشێتەکانی گومان
خەونی حیلە بریندارەکان بۆ میحرابە پەژموودەکانی یادگار دادەگیرسێنن
من لەوێوە هاتم .. لەو خۆرنشینە ئازادانەی خەونە پەمەییەکان تێکەڵ
خۆیان دەکەن
لەو خەرەندی یاخیبوون و دەمامك بەستنەدا بۆ ڕامکردنی خەونە سالارەکان
مەحیلێنە ...
قەدەر مەکە بەتایتلی کۆتاییە نەهاتووەکان
جێهێشتن و دواکەوتنی خەونە شوناسنامەی تەمەنێك لەسەراب دەچێ
بۆ سەفەری گوڵە گەنم
لەو کازێوەی پەپوولەکانی فردەوس لەبەریدا دەگرییێن
بۆ کۆتا بەجێم بێڵە
تا لەو خۆرنشینە بەخشندەی
لە ژێریدا شیعرو خەون پیاسەدەکەن
بۆ کۆتا دوات بکەوم!

www.dengekan.com
12/8/2006

**وەك پێچەوانەی با لە گەڵایەكدا ،**
**زەحمەتە بێڕەنگەكانت هەڵكەم**
**موسیبەتە..لەم توفانە پیتۆڵەدا**
**دەست لە یەكدی بەردەین**
**كارەساتە لەم مەرگەدا..**
**خوێنمان لەیەكدی جیاكەینەوە**

**دوورتر بڕوانە ئەو رەنگانەی**
**مناڵێك یارییان پێدەكات**
**قوڵتر بڕوانە ئەو عەشقەی..خیانەتەكانیش نایكوژن!؟**
**ئەسمەرترین عاشق دەیگووت:**
**(من لەبەر یەك شت دابڕام..**
**چونكە دابڕان ساناترە لە عەشق!)**
**ئەمە حیكمەتی سەرەتای دابڕانە**
**ئەمەش قەهری..كۆتایی عەشقە**
**سانا نیە..سانا نیە..نا**
**لە عەشقدا باس لە حیكمەت بكەیت و**
**لە دابڕانا قەهر نەخۆیت!**
**سانا نیە..لەحیكمەتا دابڕێیت و**
**لە قەهردا عەشق بكەیت**
**سانا نیە**
**عەشق شیتەڵی سەر حیكمەتی دابڕان كەیت و**
**دابڕانیش لە قەهری عەشقا بپێچتەوە!**

**ئەی حەرفی قەهرو رەنگی ئایندەیەکی بریندار**

**جوانتر بڕوانە ئەو شەوەی ،**

**باخچەکان،سێوێکی یاخیان کوشت**

**نزیکتر بڕوانە..ئەو دەمەی**

**شەوەکان ئەستێرەیەکی ئازادیان کوژاندەوە**

**تۆ شایەدی ئەو باخچانە بوویت**

**باخەوانە رۆحتاڵەکان درەختەکانیان تیرۆر کردن**

**تۆ شایەدی ئەو دەریایانە بویت**

**دەریاوانە بیژیەکان کەشتییەکانیان سوتاندن و**

**شەپۆلەکانیان بەئەفیون خنکاندن**

**تۆ شایەد بوویت ..لە شاردنەوەی تەرمی**

**ئەوکوڕەی دایکی زۆری خۆشدەویست ، کەلەشەڕگەکاندا کوژرا ، گووتی:**

**کەس نەیکوشت ، کەس نەیکوشت تەنیا باوکی نەبێت**

**تۆ شایەد بویت**

**ئەم پیرە دارانە بە رۆحی ساردیانەوە**

**لە کەنارەکان قوماریان لەسەر قەدەری گەردەلولەکان دەکرد**

**شایەدبویت**

**رۆحی جەنگەڵەکان بەخوێنی عاشقەکانەوە گەورە دەبوو**

**شایەدبویت**

**باڵندەکانی مردن دەیانگوت**

**نابێت..جوانی لەم ئاواییەدا گەورە بێت**

**گوڵەکانی جەهەنەم دەیانگوت**

**دوایین دەرگە..بۆفرین داخەن**

**زریانەکان..**

**رەگی ئەفسانە و موعجیزەکان دەکێشاو دەیانگوت:-**

www.dengekan.com
12/8/2006

(( ماچ وەرزێکە لە گوناه )

ئێمە لە وەرزێکەوە هاتین..

نێرگزەکان تیایدا نەیاندەتوانی مەرگ تەئویلکەن

مەرگی وەنەوشە و یاسەمینەکان لە بەهاری باخچەکانی هەڵەبجدا

مەرگی خاتوونە رووکەنەکان لەشەوە شەرمنەکانی ئەنفالدا

ئێمە نەوەی وەرزێك بووین

لەهەموو ساتەکانیدا بخوری مەرگ دەسووتا

لەو ساتانەی رێگەی غوربەت و بەهەشت ئاوێزانی یەکدی دەبون

لەو ساتانەی کچێکی سنێل بەرووی عاشقەکەیدا پێدەکەنی

لەو ساتانەی بێوەژنێك لاسکە گیایەکی دەخستە نێوان مەمکەکانی

لەوساتانەی باخەوانێك گوڵی حەرفێکی یاخی دەچاند

لەو ساتانەی دەریاوانێك بەدوای گەواڵە هەورێکی ئاوس بە

حەقیقەتێك لەبۆنی رێحان و لە رەنگی نەورەس دەگەڕا..

بەداخەوە ئێمە شایەدی ئەو ساتانە بووین

تاڤێك لە گزنگ پێی نەدەکرا

وەك خوناوێك لە وەفا..شەوقێك لە سەفا

لەبن پەرچەمی جارییەکدا بڕژێ و بە پێغەمبەرەکانی نیشتمان

بلێت،کتێبەکان..رمەکان..ئەسپەکان بۆ خوتان و

پەرچەمی ئەو کچە بۆ هەوەسێك مەبڕن!

شایەدێك بۆنی قەتمەرەکانی غوربەتی لێدەهات و ماسۆشیانە

دەیڕوانیە ئەو زەمەنەی لەرێگەی نێوان ئێوارەو نێرگزدا بەعەبەس لە روح

دەرژا..

شایەدێك نەیتوانی..بۆنمایشی کوریکە خۆخەکان..شانۆیەکی عومر درێژتر

12/8/2006

لەبەهارەکانی ولاّت پەیدابکات..
بێئاگا..لە جەهەنەمی ئاگری لێوکان و
لە بێداری پەیڤەکان
مێژوو غافڵ لە ترازانی پەنجەکان
هەناسە،خاڵێ لە لەزەت
شوناسنامەکان پەرت..پەرت
بزر وەك سەراب
***
چی دەمگەیەنێتەوە تۆ ئەیدۆست؟
ئەو باخچەیەی پیایدا رەتبووم
ئێستاکە درەختەکانی شەرت
لەسەر چاوی یەکدی دەکەن
بۆ مژێ ژەهرو..قومێ زریان
ئەو دەریایانەی..بەگەمییەك لە تریفەوە
تیایدا بووریم
ئێستاکە رێبوارە میهرەبانەکانیان دەخنکێنن
ئەو ولاّتانەی دوا جار چرایان کرد بە ناوچەوانمەوە
ئێستاکە عەتارچییەکانیان..تاعون بەکوّلاّنەکاندا ئەگێڕن..
ئەفسوس،کە رۆیشتم..
لەتولەڕێی شیعرێکدا بەتۆ ئەگەیشتم
دەرفەت هەبوو..پیاسەیەکی سپی بەسەر گیاکانی وەفادا بکەین
چەند ساتێك بە خۆشنوودی وەنەوشەیەکەوە سەرقاڵبین
ئەیدۆست کێ دەمگەیەنێتەوە تۆ؟
من وەك شەماڵێکی هەرزەکار بەڕێگە شۆخەکانەوە تێپەریم

ئێستا لەهەر پێچێك چەقۆی كێشێكی لاسار چاوەڕێم دەكات تا حەقیقەتەكانم تالآنكات

من كە ڕۆیشتم..

تابلوكانم دابوونە ڕەنگارەیەك بۆمی هەڵگرێت

ئەو ڕەنگە بەهەشتییەكانمی لە قومارخانە ڕەشەكاندا دۆڕاند

ئەیدۆست تۆ،كە

حەقیقەتێك بوویت لە ئەفسانەی زەوییەكانم

ئیمانیٚ بووی لە كێڵگە سەوزەكانی خەیاڵ..

موعجزەیەك بوویت لە ئەستێرەكانی تەئەممول

بەچی دەگەمەوە تۆ؟

بەخوا..بەروح..یان بەعەبەس؟!

ئەیدۆست

ژیان گەورەتر بوو لەوەی من ناسیم

هەستەكانیش بچووكترن لەوەی وجود بناسن

خەیاڵەكان لەئیمان و

خەونەكان لە ئاگا..نزیكترین لە ڕۆحی ساتە تاریكەكانی حەقیقەت

من یەقینەكانت بەشكانی حورمەتی پیرۆزییەوە تالآن دەكەم

وەك چۆن گومانی تاووسیانە،یەقینەكانی خوا تالآن ئەكات

دەبێت..ماچ هەبێت و خۆشەویستی هەبێت و عەشق هەبێت وسزا نەبێت

دەبێت..جوانی هەبێت و گیا هەبێت و بەهار هەبێت و مەرگ نەبێت

دەبێت..لەزت هەبیٚو جەستە هەبیٚو خەون هەبیٚ و خیانەت نەبێت..

دەبێت..وشەهەبێت و شەو هەبێت..پیربوون نەبێت

دەبووایە..دەبووایە..من هەبام و تۆ هەبایت وخوا هەبیٚ و.. قەدەر نەبێت!

حەقیقەتەكان هەمیشە لە ساتە تاریكەكاندا گیرۆدەی نمایشی خۆیانن

حەقیقەت..ساتی بێهۆشی سەر خۆشەكانە..

**کە–با–فەرامۆشیان دەکات**

**حەقیقەت فەزای خاڵی ژوانێکە..کە ڕەنگ جێیدەهێڵێت**

**حەقیقەت حەرفێکی پیرە.. قەڵەمێك گۆچانەکەی دەدزێت**

**حەقیقەت ئەو لەزەتەیە.. فەوتانی کچێنی تاڵانی دەکات**

**حەقیقەت ئەو گوڵە گەنمەیە.. زەوی لە ڕەشەمێدا فەنای دەکات**

**حەقیقەت سەدای خنکاوی ئەو هەورە یاخییە بوو..نەفرەتی لە دەریاکانی قەدەر کردو**

**بەبارانەکانی یەقینی وت:**

**لە ئێوەنیم**

**حەقیقەت.. هاواری ئەو وەنەوشە ئەسمەرە بوو**

**لە باخچەکان عاجز بوو و بەگیا جەهەنمییەکانی وت:**

**سۆزانی نیم**

**حەقیقەت..فرمێسکی سۆزانییەکی پیرە..بۆ منداڵی**

**کەهەوەسبازەکان فەرامۆشی دەکەن**

**حەقیقەت..ڕاستی ساتی ئەو خۆکوشتنەیە..**

**کەنابووتی مەرگ فەنای دەکات**

**حەقیقەت..هەمیشە و هەمیشە..**

**ئەوساتە تاریکەیە**

**شەو تێکەڵی خۆی ناکات و**

**((هەموو چراکانی دونیاش نایدۆزنەوە!))**

*** * * ***

**ئەی دۆست کە ڕۆیشتم..دەتگوت**

**( فتنە جوانەکانت**

سەفایەکن سەما بە حەقیقەت دەکەن

لە ئاسمانی ژەهردا فڕینێکن لە بۆنی گوڵ

تۆ وەك ( با ) لەگەڵ رۆحی جوانیدا هەڵدەکەی

کێ دەزانێ پێشبینی هەورو باران و نێرگزەکانت بکات!

تۆ بەو عەشقە سپیەوە..

تۆ بەو دوورییەوە:

بەختەوەری وەنەوشەیەکی..دوور لە باخچەکانی پیریدا

پێکەنینی یاسەمینێکی..دوور لە بەهارەکانی شەرمدا

خەندەی گولەی گەنمێکی..دوور لە زەوییەکانی دڵرەقیدا

تۆ بەرۆژ و باڵندە و گیاو بەردت گوت:عاشق

تۆ بە پرسیار

خاکی خۆت دوور لە زێدی خۆت چنگکەوت بۆ پیاسەکردن

ئیدی تۆ موسافیرێکی سەر گوزەشتە نیت..لەرێگاکاندا ون بیت

تۆ جەنگاوەرێك نیت..لەشەڕە بێناموسەکاندا بکوژرێیت..

زاهیدێك نیت لە غەیبێکدا بخنکێیت

تۆ باخچەیەکت هەیە دوور لەبەهار گوڵی تیا بچێنیت

ئاسۆیەکت هەیە..دوور لەئاسمان بۆ فڕین

ئەسپێکت هەیە..لەتەویلەکانی نیشتماندا ئوقرە ناگرێت

گولێك هەیە..بۆنی دەکەیت..دوور لەو عەترە خوێناوییەی لە گەڕەکانی شاردا

لە بن پێی سوارەکاندا پژا..

رەنگە ژیانیش بۆنکردنی گوڵێك بێت..دوور لەئنجانەکانی بەر پەنجەرەی ماڵ

تۆ مەرگێکی زارابیت هەیە..دوور لە گاتاکانی نیشتمان..

رەنگە ژیانیش لە لەحزەیەکدا..تەنیا مردنێکی ئاسوودە بێت دوور لە

ئایەتەکانی نیشتمان

www.dengekan.com
12/8/2006

**ڕەنگە ژیان لە لەحزەیەکدا شەتحەیەك بێت..لەتەهلیلەی فەنابوون .. لە زیکری ئاسمان.**

**پایەداریت..ئەی خاوەنی زمان و هەتاو و نێرگز**
**پایەداریت..ئەی ئەو کەسەی کوڕی کەس نیت**
**پایەداریت.. ئەی ئەو کەسەی باوکی کەس نیت**
**تۆ تەنهایت و..بەهاری خۆت هەیە**
**تۆ موسافریت و..وڵاتی خۆت هەیە**
**بێدەنگیت و زمانی خۆت هەیە**
**پایەداریت ئەی تەجەللای نوری خۆت**
**پایەداریت ئەی مومارسی خەونەکانی خۆت**
**تۆ لە وەرزێکەوە.. بەرەو ئەفسانەیەکەوە دەچیت**
**ئەفسانەیەك..ژیان لە گەڵایەك و مەرگ لە بەهارەوە دەبینیٚ.**
**ژیان لە گەواڵە هەورێك و مەرگ لە بارانەوە دەبینیٚ**
**پەنچەرەو ئنجانەکان گەواهی دەدەن..**
**پایەدارە ئەوەی نورو زمانی هەیە..**
**پایەدارە ئەوەی عەشق و شیعری هەیە..**
**پایەدارە ئەوەی لەوەرزێکەوە..بەرەو ئەفسانەکان بچێت...!**

* * * *

**تۆ ئەی برادەر گیان**
**تۆ شایەدی جوانی کوریکە خۆخەکان و بەهارە کورتەکان بوویت..**
**تۆ شایەد بوویت بە سریالیەتی ئەو هەموو مردنە فەنتازیای ژیان ڕەنگی نەئەگرت**
**بەو هەموو جەستە تێنوو و پاکیزانە..نەدەکرا عەشقێك گوڵ بگرێت**

نەدەكرا..لەم ئاوایەدا بۆنی ماچ بە كۆڵانەكاندا بگەڕێت

نەدەكرا..قەیاغێك لەئەستێرە بەدیاری بدەینە شەوە تاریكەكانی رۆح

نەدەكرا..زمان بگاتە ئاقاری سیحرو..پەیڤ گەورەتر بێت لە رستە

نەدەكرا..مەرگ نەڕژێتە ناو رێحانەكان و بۆنی نەپژێتە ماڵەكەمان

نەدەكرا هێندەی پێچانەوەی– با – لەلاسكە گیایەكدا..لەقەتمەری رێگەكانی غوربەتدا..

زەحمەت بوو، لەرۆحی جوانیدا..لەنوردا..لەیەسنایەكی

زاراییدا..وەك..تاووسێك..بەرەنگەكانی

(هەق و خێرو جوانی) بنازم..

بەتولە رێكانی ئیمان و موعجیزە و پێغەمبەرەكان..بڵێم

بمبەنەوە سەر رێگەكانی رێحان و نازنازەكان..

بەكتێبەكان بڵێم..بخوری یاخیبوونێك..لەو كارەساتەدا داگیرسێنن..

بە رمەكان..شمشێرەكان..بڵێم..لێگەڕێن با كاروانێك لە ئەستێرە،باخچەیەك لە سروە..

بەهارێك..رووبكا بەم وەرزەدا،

بەو ماڵە پڕلە غوربەتە بڵێم ئنجانەیەك لە شیعرو باران لەبەر پەنجەرە بۆ جوانی دانێن..

بەم فۆلكلۆرە بێژم، عاشقەكان با هەمیشە نەمرن

بەم چیرۆكە بڵێم،با عاشقەكان هەردەم بچووكترنەبن لە ئەفسانەكان

بەم داستانە رابگەیەنم،با عاشقەكان هەموو گاڤێك بێ رۆشنایی نەبن

ناكرێت..بێرەنگەكانت وەك – با– هەڵكەم

وەك رەنگ یاری بە گوڵ و باخچەكان بكەم..

مینا شنەبایەك لاسكی گوڵەگەنمەكانی جوانی لاركەمەوە..

كچەكان بەرەو كێڵگەكانی هەتاو هەڵگرم..

كوڕەكان بكەم بە گزنگ..

# گەڕانەوە بۆ ژوورەکانی مردن

27 / 12/ 2001 دهۆك



ئەمجارەیان تۆ لە ئێوارەیەکی زۆر زۆر هێمندا.. هێمنتر لە چاوەکانی تاووس
و لەرەی کاژو رۆیینی هەورێکی بەناز لە ئاسمانی وەنەوشەدا
لە ئێوارەیەکی زۆر زۆر ئارامدا .. ئارامتر لە دەنگی باران و پێیەکانی نێرگز
لەسەر سۆمای لاسکە گیایەکی کێوی
تۆ ئا لەم نەرمی و ئارامی و هێورییەدا .. هێورتر لە خشپەی لاسکە گیا لە
کاتی نوێژدا و هێورتر لە شۆڕبوونەوەی شەنگەبی بەسەر ئەبرۆی
مێکوکەکانی جوانیدا
لە دەمێکی زۆر ناسکدا ..، ناسکتر لە هەتاوو و بۆنی رێحان و کەمەری
یاسەمین و قەدی نیسانۆکێك..
لە کاتێکی نازکدا ..، نازکتر لە بەناز و نازنازۆك ونازی زەیتوون بەسەر
گۆڕستاندا
تۆ وەك تۆفان .. هاتیتەوە ژوورەکانی مردنمدا.....
وەك بارۆقە خۆت کردەوە بە ساپیتەکانی فەنابوونمەوە .. لەو ئێوارەیەدا
یەقینێك پێیدەگوتم تۆ ئەبەد جارێکیدی سەرناکەیتەوە بە سەر مەرگەکانداو
ئاوڕ لە فەنابوونەکاندا نادەیتەوە .. تۆ هاتیتەوە
هاتیتەوە مەرگەکان بلاوێنییەوە .. فەناکان بنازێنییەوە
هاتیتەوە وەك بارانی تورە .. سەرکەیتەوە بە باخچە تورەترەکان
وەك بای تورە خواربیتەوە بۆ ماڵە توورەترەکان .. هاتیتەوە وەك نامەیەکی
زوویرو زەبر بۆ خوێندنەوەیەکی تورەتر لە کورەکانی تۆران..
هارتر لە کچی حەرفە هاجەکانی دەفتەری بیرەوەرییەکانی مردن
وەك خوای تورە لە پێغەمبەرە شەرمنەکانی .. وەك گیای تورە لە لاسکە
نەرمۆڵەکانی .. هاتیتەوە
لەم ئێوارە نەرمەدا .. نەرمتر لە زمانی مارو گەشتر لە پەرەکانی کۆلکە زێرینە
هاتیتەوە ژوورەکەمت پڕکرد لە حەرفی تورەو وشەی یاخی..

**ماڵەکەمت تژی پاییز و وەرزی تووش کرد..**
**باخچەکەمت بردەوە دەورانی گوڵە تۆراو و پرتەقاڵە زیزەکان و سێوە زوویر و گەرازە عەسەبییەکان و خۆخە فێگرتووەکان**
**لەم ئێوارە سووك و ئاوییەدا .. هەموو کوریکە بەهارییەکانت سەرخۆشکردن**
**بە بۆنی ئەو پەیڤانەی لە دەفتەرەکانی مردن و فەنابوونتەوە دەڕژێن...**
**بەم ئێوارە پڕ جریوەی نیان نیان .. نیانتر لە لۆکەو پەنجەکانی پەپوولە ، لە دەسماڵەکانی هەنگ .. لە خورجینەی ڕێحان .. لە ئاهەکانی کوریك ماست**
**بەم ئێوارە ئاسوودەیە .. ئاسوودەتر لە هێلانەی شالوور و لە ویژدانی گوڵ محەمەدییەکان ..لە هەیوانی ماڵی کنێر .. لە بەژنی باریکی ئێوارە خۆی گەڕایتەوە و باخچەکەمت.. گەڕاندەوە کۆشتەوە.. کۆشی تووڕەتر لە سەبارەکان**
**لەم ئێوارە دڵنیایەدا .. دڵنیاتر لە سەراب و لە تامی شەڕابی کۆن**
**هێدیتر لە دەنگی خوناو و وەفای پەلکە، گیا و هەنسکی کۆتر..**
**لەم ئێوارەیەدا بەخۆت و گەردەلوولی پەیڤەکانی خۆشەویستییە تاریکەکەت دەستت لەو برینانە دایەوە**
**ئەو برینانەی چەندین سەدەیە وەك زەخیرەی زستان لە وێستگەکانی دووریدا هەڵمگرتوون**
**ئەو برینانەی تەنیا بە تۆفانەکان و گەردەلوولەکانی مردن و تاعونەکانی تۆوە ئەکولێنەوە**
**ئەو برینانەی تەنیا بە پەنجە خوێواوییەکانی حەرفەکانت ئەسووتێنەوە ..،**
**حەرفە بێدین و ئیمانەکانی فەنابوونت**
**حەرفە جەهەنمییەکانی مەرگت**
**مەرگی یەکانەو مژاوی و نوتەکت**
**ئای لەو مەرگە تاریکەی تۆ**
**ئای لەو فەنابوونە ناڕوون و مژاوییەی تۆ**

www.dengekan.com
12/8/2006

**ئای لە تۆ لە برینەکانی من و دەستەکانت**

**لە حەرف و وشەو دەستەواژە و گەردنەکانی من .. گەردنی گوڵەکانم ..**

**مەچەکی باخچەکەم.. ئەژنۆی هەیوان و حەوشەی دەفتەرو کتێبەکانم**

**ئای لە منداڵیم لە نێو پەنجەکانی تۆدا**

**ئای لە عەشقم لە نێو باوەشی تۆدا، ئای لە عومرم لە کۆشی تۆدا ، ئای لە خەونەکانم لە نێوان مەمکەکانی تۆدا**

**ئای لە خۆم لە تۆدا، ئای لە فەنابوونم لە تۆدا ، ئای لە مەرگم لە چاوانی تۆدا**

**ئای لە دەنگم لە نمایشەکانی تۆدا، ئای لە ژیان و وجود لە دارستانەکانی رۆحت**

**ئای لە جواناوی وەفاو جوانی لە سەر ئەنیەت**

**ئای لەو دڵە ئای لەو سەرە لە نێو رەفتە سپییەکانی سەر ملانی ئەندێشەت**

**ئای لەو کزانەی لە جەرگمەوە دێنە دەرێ لە نزیکی تۆوە**

**ئای لەو ئاهانەی لە بەژنمەوە هەڵئەوەرێن لە حزوری تۆوە**

**ئای لەو جەستەیە کە تۆ دێیتەوە ..**

**تۆ لەم ئێوارە هێمنەدا لە دوورەوە وەك بروسكە دێیت، لە ماڵی پەپوولەوە نایێت .. لە پاییزێکی ئاوس بە بەرق و ئاگرەوە دێیت**

**لە پایزێکی تاریك وەك شەوە نووتەکەکانی وێستگەکانی مەحفبوون**

**لە دیوانێکەوە دیێت وشەکانی لە مەرگ و دەستەواژەکانی لە جەهەنەمەوە بەرەو قووڵترین فرمان ئەڕۆن**

**تۆ لە هەیوانێکەوە هەڵدەکەیت کە هەرگیز لە ساپیتەکانی مەرگەوە نایەتە خوار.. هەرگیز تێرنابێ لە دیمەنی فەنابوونم**

**تۆ لەزستانی سەدەکانی بەفرینەوە خراپتر ... قەت لەو دەریایانە بێ شەختە و کرێوە و زریانەوە دەرباز نابیت ..**

**رووباریٚ ناتوانیٚ دوا تنۆك سەرمایی خۆییت نەداتیٚ ..دارستانێك ناتوانیٚ دوا قەترە تاریکی خۆییت بە شەوەکانتەوە نەبەخشێت ، سپێدەیەك ناتوانیٚ دوا هەناسەی خووسگرتووی نەکاتە دیاری بۆ چاوەکانت ..**

**تۆ لەو دوورییەوە وەك عاجباتییەك دێیتەوە ..عاجباتییەکی دڵرەق، رەقتر لە ئایەتەکانی جەنگ و ئاوازەکانی ئەڵماس ..**

**دێیتەوە و هەموو ئەو باق و بریق و شەوقەی پەیڤەکانم چەندین سەدەیە لە باخچەکانی عەشقەوە کۆی ئەکاتەوە بە نەفخێك لە سوورەتی چاوەکانت ئەم پەیڤانە وەك پەلکی رێحانێك لە پەنچەیەکت دەبەستیەوە.. وەك لاسکە گیایەك دەیخەیتە نێو ددانەکانت.. وەك خوناوێك دەیخەیتە سەر برژانگێکت**

**تۆ کە گەیشتیتەوە باخچەکەم ئیدی ئاسانە .. وێرانمکەیت .. ئاسانە بمکوژیتەوە.. ئاسانە لەگەڵ چاوی زەردی پرتەقاڵێکەوە بمخۆیتەوە ..**

**ئاسانە لەگەل پەلکە گیایەك پەنچەکانم داعویری**

**ئاسانە لەگەڵ ماڵ و کتێبەکانمدا تالاٚنمکەیت .. ئاسانە لەگەل دارخۆخەکاندا بمبڕیتەوە.. لەگەڵ سێوەکاندا قاشقاشم کەیت .. لەگەڵ رێواسەکاندا هەڵمکێشی.. لەگەل بەڕوەکاندا بمبەیتەوە ئەوبەرەکەی هەبوون و پشتپشتی چیاکانی وجود..**

**ئاسانە لەگەڵ کەنارییەکان باڵم بکەیت و لەگەل پاسارییەکان ئاوارەم کەیت..**

**تۆ کە گەیشتیتەوە هەیوانەکەم .. ئیدی ئاسانە مردنم ، ئاسانە خۆکووشتنم .. ئاسانە فەنابوونم**

**تۆ کە گەیشتیتەوە سەر مێزەکەم ئاسانە لە شیعرێکدا ، لە وشەیەکدا، لە حەرفێکی نابووتدا فەنامکەیت ..**

**ئاسانە لەگەل دەستەواژەیەکدا ونمکەیت... ئاسانە بمبەیتەوە سەرەتای سەرەتاکان.. سەرەتای مەرگ و ژیان.. بمبەیتەوە ساتی لە دایکبوون و ساتی جیابوونەوەم لە یەکەم گۆڕو پێنانە دواهەمین ماڵ و زەوی ..**

ئاسانە زوویرم کەیتەوە لە گەڵ ساتەکانی توڕەبوونم لە خواو لە پێغەمبەرە دڵرەقەکان .. لەگەڵ حەرفە بێ جوانییەکانی مەکتەب و مامۆستا دار لە دەستەکان کە هەمیشە شەیدای لێدانی من و کوشتنی کۆترەکان بوون کە هەمیشە کوشتەی گریانی من و فرمێسکی نێرگز بوون..

کە هەمیشە عەودالّی هاوارەکانی من و ئێشی دالیاکان بوون..

کە هەردەم لە جوگرافیادا لە زەوییەك ئەگەڕان تا لەوێ بمکوژن لەگەڵ حەزەکان و رەشۆڵەکاندا بمکوژن لە تاریخێك ئەگەڕان لەوێ بمشارنەوە لەوێ لە گەڵ ئازادیدا بنێاخمکەن هەمیشە لە حسابێك ئەگەڕان لە قیامەت توندتر بێت ..

هەمیشە لە گۆرانییەك لە نەشیدێك ئەگەڕان تا منی تیادا سەرگەشتە کەن ئەو مامۆستا بێڕەحمانەی بە لێدانی من و یاسەمین و دالیا و کۆترەکان و هەنگەکان نەخۆش بوون..

هەردەم لە دینێك ئەگەڕان تا جهاد و فەتواکانی خۆیان لە سەر لەشی من و کۆترە کێویلکەکان ئەنجام بدەن..

ئای لە تۆ کە ئێستاکە حاکمی دیوان و ماڵ و دڵ و دەماغی منی..

تۆ ئێستاکە تەواو لەو مامۆستایانە ئەکەیت کە دڵت بەو دەرسانە ئاو ناخواتەوە کە بۆنی باروت و خوێنی لێنایەت

تۆ کە گەیشتیتەوە سەر من وەك ئەوەی گەیشتیتەوە گەنجینە دزراوەکانت .. وەك ئەوەی گەیشتیتەوە بەو شعرانەی لە دیوانێکتەوە دزراون وەك ئەوەی گەیشتیتەوە ئەو ئاوازانەی لە گۆرانییەکانتەوە هەڵفڕیوون..

لەم ئێوارە هێمن هێمن و ئارام ئارام و نەرم نەرم و ناسك ناسكەدا ..

بەو تۆفان و بروسکە و زریانانەوە گەیشتیتەوە ماڵەکەم... بەو پاییزو زستان و رەنگانەوە لە باخچەکەمەوە سەردار و سەروەریت..

ئێستاکە ئاسانە لە دار ئازارێکەوە موتربەمکەیت

ئاسانە بە لقی ئەرخەوانی ئێشێکەوە گرێمدەیت..

www.dengekan.com
12/8/2006

بەداری مردنەوە بمبەستیتەوە..
به لقی کوشندەترین کوشتن هەڵمواسی
ئاسانه لەگەل دارخۆخێکدا ئنتحارم پێبکەیت..
ئاسانه لەگەل گژوگیادا بەرەلاَی ناو ئاگرێکی سەرمەدیمکەیت..
سانایە لەگەل بخورەکاندا دامگیرسێنی..
تۆ له ماڵی گوڵەکانەوە نەهاتوویت..،
له باخچەکانی گۆرانییەوە نەهاتوویت..،
تۆ له بێزارییەکەوە دێیت..
بێزارییەك یەقینەکانی بەهەشت به جەهەنەمەکانی گومانەوە ئەگۆڕێتەوە،
ئنجانەکانی ژیان پڕ ئەکا له نازنازەکانی مردن،
تۆ له ئازادییەکەوە دێیت پڕە له کەلەپچەو ژوورەکانی فەنابوون..
پڕە له کۆترە شینکەی گیراو..
له دڵۆپە ئاوی خنکاو تۆ له بەهارێکەوە دێیت..
پەلکە زێڕینەکانی فڕێدەدەیت و گیانت پڕدەکەی له دوکەڵ و ئاگر..
خۆت له بۆنی بخورەکانی فەنابوونەوە هەڵدەکێشی..
تۆ که هاتیتەوە سانایە دەست له ئاگر بدەیت ..
پەنچە لەو برینانە بگێڕیت..
دەست لەو روحانەوە بوەشێنی..
پەنچە لەو هەتاوانە بئاڵێنی..
سانایە، شاتانەکانت بدەیتە بەر رەشەبا، رەنگەکانت بەر زریان،
سانایە تێکەڵم بیت..
پەنچەو هەناسەو سێبەرت له پەنچەو سێبەرو هەناسەم بئاڵێنی
سانایە، ئەمجارەیان له نێو دەفتەرێکدا بمکەیتەوە به باران و به خۆرەتاو
که گەیشتیتەوە بەهرەکانی نووسینەوە، سانایە له شعرێکدا بمکەیتەوە به
رەشەباو به رەگەکان..

سانایە لە منەوە بەرەو ناونیشانەکانی نەمرییەوە بەرەو مێژووی گوڵ و سەرەتای بۆن بگەڕێیتەوە..

بگەڕێیتەوە بەر دەروازەکانی مردن و فەنابوونی من و خۆت، بگەڕێیتەوە ساتەکانی بەر لە تێکەڵاوبوونمان..

ساتەکانی جوداییمان..

لەحزەکانی دووری لێوەکان لە ماچ..

دووری پەنچەکان لە گووشین..

دووری چاوەکان لە نەزەر..

دووری زمان لە خۆشەویستی..

دووری گیان لەعەشق و دووری روح لە فەنابوون..،

تۆ لە هەراسانییەکەوە دێیت، و تەنیا دەرگەی ماڵی من ئەبینی، تەنیا گوڵەکانی بەر هەیوانی من بۆن ئەکەیت، تەنیا هەستی پەیڤەکانی ئەم دیوانەم ئەکەیت،

تۆ .. ئەی گوڵە نێرگزی تورە..، ئەی گوڵە گەنمی تۆراو.. ئەی خوای تووش، ئەی خاڵی سفری شێت بوون

لەم ئێوارە نەرم نەرمەدا.. تۆ چیت ئەویێ لە هەورە بەنازەکانی سەربانی من..

تۆ چیت ئەویێ لە زەوقی شعرو کەیفی پاسارییەکانم..

چیت ئەویێ لە خۆشی رێحان و شۆخی یۆگاکانم، چیت ئەویێ لە مردنم لەو مردنە خۆشبەختەم ..

چیت ئەویێ لە فەنابوونم لەو فەنابوونە بەخشندەم..،

چیت ئەویێ لەو باخچە میهرەبانەم ، لە کۆترە دلۆڤانەکانم لە پەنچە سۆزاوییەکانی هەتاوی ژوورەکەم

ئەزانم تۆ لە دوورەوە دێیت لە ئێوارەیەکی هارو هاجەوە دێیت..

ئێوارەی تۆ جیایە لە ئێوارەی من ..

تۆ لە ئێوارەیەکەوە روو ئەکەیتە من ..،

پڕە لە ماسك و پاییزو تاریكی..
پڕە لە تووڕەبوون و فرمێسك و گریان ..
پڕە لە پەشیمانی پەشیمانی لە سەفەرو جێهێشتنی ژوورەكانی مردن ..
جێهێشتنی ژوورە تاریكەكانی عەشق ..
پەشیمانی لە هەڵاتن بەرەو خۆرەتاوی ئێوارە تووشەكانی ژیان ..
بەهەشتە دوورەكانی فڕین
پەشیمانی جەستەت دایە بەر بارانەكان ئەو بارانانەی واتئەزانی قەرزی خۆشەویستیت لە لا هەن
واتئەزانی نمە دەرمانی پەسیوی خۆشی وچپكی شروبی بەختەوەریان بۆ هەڵگرتوویت
سانایە تۆ كە بەم بێزەوقییەوە بێیتەوە، بەم تۆفان و زریانەوە بێیتەوە
سانایە كە تۆشەیدای مردن و فەنابوونی من و خۆتی
كە هێندە كوشتەی تێكەڵكردنی ئێوارەكانی من و خۆتی..
ژوورەكانی مردنی من پڕ لە ژیان و باران كەیت
لەهۆڵەكانی فەنابوونم شتگەلەكانی عەشق تێكەڵاو كەیت
ژەهرێك بۆ خۆشەویستیمان بگرییەوە ، ئەفیونێك بدەیتە چیرۆكەكانم ..
جێیەك لەم هەیوانەم بۆ خۆت راخەو تا ئەبەد تیایدا بمرە .. تیایدا
مومارەسەی جوانترین مەرگ و دڵبەرترین فەنابون و ئەزیزترین لە ناوچوون و شیرینترین نەمان بكە . لە گەل مندا لە گەڵ دەفتەرو رێحان و یاسەمین و شلێرو مێلاق و خەونەكان.. لە گەل نازداری هەنارەكانی حەقیقەت و سوورو سپیاتی سێوەكانی وەفاو گەرازەكانی جوانی و قازمانە ترشەكانی سەماو خۆشی .. لە گەل هەموو گریێیەكانت .. نەخۆشییەكانت .. حەزەكانت .. گریانەكانت .. زریان و تورەبوونەكانت.. لە گەل هەرچی سەرمایەی هەتە لە زمان و سحرو جوانی .. لەگەل هەموو خەون و توڕەبوون و نووسین و پیاسەكان ، تۆ خۆت و شەو و تاریكییەكانت.. دارستان و گژوگیاو و

www.dengekan.com
12/8/2006

**دەریاکانت .. هەموو کوریکە پەمبەکانت .. دار خۆخەکانت .. لە ناو**

**جوانترین حەرفی مندا لە ناو شەنگترین وشەی مندا لە ناو شۆخترین**

**دەستەواژەی من و لەناو ئازیزترین دێرو لە ناو خۆشەویستترین شیعرمدا**

**بمرە ..**

**بمرە...**

**بمرە...**

**ئارامترین مردن ..**

**ئارام ئارام ..**

**وەك سنەوبەرەکانی سەرگۆرستانەکان نا..**

**وەك ئێوارەی کێڵگەکانی گەنم نا..**

**وەك هەناسەی من ئارام ..**

**نەرم نەرم وەك رۆیینی مارو چاوەکانی کاژ نا ..**

**وەك پیاسەی خوناو لەسەر پەلکی سێپەڕە نا..**

**وەك دەنگی من نەرم ..**

**بمرە ..**

**نەرم نەرم وەك ئەم ئێوارەیە نا وەك چاوەکانم  ئارام ئارام بمرە .. بمرە..**

**بمرە.......**

**لێرەدا لە ژوورەکانی مردنمدا لەگەل کتێبە کۆنەکانی خۆتدا لەپاڵ سێبەری**

**چاوەکانت و تاریکایی خۆشەویستیتدا..**

**لێرەدا ئازادی و یاخیبوون و سەفەرو گوڵ و شعرەکانت بە مەرگێکی**

**ئاسوودەوە بگۆڕەوە،**

**بمرە تۆ لێرەدا پێویستیت بە سێبەرو سنەوبەرو کاژ نیە، لێرە بێدەگییەکی**

**بەخشندە هەیە..**

**بێدەنگییەك وەك باخچەکەم میهرەبان..، وەك ئێوارەکانم شەنگ و شۆخ..،**

**لێرە بمرە.. لەو ژوورانەدا ..**

**تۆ لێرەدا گەورە بوویت .. لێرەدا فێرە قسەو زمان بوویت..، لێرەدا فێرە شێتی و یەکەم شەتحە بوویت..**

**ئێرە مەڵبەندی دڵبەندی و دڵگیریتە..، ئێرە رووبەرەکانی جوانیت پێکدەهێنن.. بێرەدا ئەچیتەوە مردنەکانم..، بێرەدا ئەچیتەوە جەهەنەمەکانی عەشقی من، بێرەدا رەت بە، بیّ رەشەبا و زریان ، بیّ هەموو شتێك ..**

**بارگەو بنەی زمان لەبەر دەروازەی ئێرەدا فڕێدە..،**

**لێرەدا پێویستیت بە هیچ نیە..**

**نە وشە و نە خەنجەر..**

**نەجوانی و نە هەڵاتن..**

**نە هەتاو و  نە باران ..**

**نە ماریفە و نە خوا..**

**نە پێغەمبەر و نە سۆزانی..**

**تەنیا خۆت رووت رووت، وەك باران رووت ..**

**وەك شاتانێکی تەنیا..**

**وەك خوایەکی تەنیا، لێرەدا تەنیا و تەنیا بە رووتییەوە ئەگەیتەوە مەرگی من، بە تەنیایی ئەگەیتەوە فەنابوونی من،**

**تەنیا بێرەدا..**

**بە مەرگی من و فەنابوونی منەوە..**

**ئەگەیتەوە بە ژوورەکانی مەرگ و فەنابوونی خۆتەوە....**

**ناوێریت سەیری ئاسمان و بارانەکان بکەیت**
**لە تەماشای پروشکەی بەفرانباری سینە و گەرمای تەمموزی چاوەکان ئەترسیت**
**لە رەنگی شیعرەکان.. لە سنەوبەری هەناسە ..**
**لە سێبەری لێوەکان ..**
**بزدیای**
**ئەی تامی بەفر و کوشتەی رەنگی کاژی جاویدانی**
**بترسە .. بترسە لەم چارەنووسە هاوبەشەی من و تۆ وەك کەمەرو لاسکی گیا بەیەکەوە ئەبەستێتەوە**
**بترسە ئێمە شەریکی گەمەی عەشق و فڕینەکانی مەرگین**
**بایەك راپێچی دوورگە نزیکەکانی دووری و دوندە دوورەکانی هاوسێیەتیمان ئەکات**
**بەم دوورییەتەوە لەمن ئەچیتەوە کەنارەکانی نووسین**
**لەم نزیکییەتەوە لە قەراغەکانی نوسینەوە دێیتەوە ناوم**
**لەم ناوە غەریبەوە بە هەناسەم ئاشنا ئەبیتەوە**
**لە ناوی منەوە بەرەو دوورترین ناسنامەوە هەڵئەفڕیت**
**ئیدی من و تۆ شەریکین، شەریکی ناو و زەمان و شوێنی پەنچەکان**
**شەریکین لە خەونی کوکوختی و کوریکەکان لە بەهاردا**
**شەریکین لە گمەی پایزی باخچەو ترپەی بارانی یەکەم هەوری ئاوس**
**شەریکین لە خەزنەکانی خەمی رووبار و خۆکوشتنی رێحانەکانی باخچە**
**شەریکین لە هەڵگرتنی نازی گوڵهەنارەکانی گولان و کلوی ژانەکانی پیری شاعیر**
**شەریکین لەو شەڕانەی من یان تۆ یان گوڵێك یان شالوورێك لەگەل تەمەن ئەیکات**

www.dengekan.com
12/8/2006

**شەریکین لە یاخیبوونەکانی پەپوولە لە زەمەن**
**شەریکین لە توڕەییەکانی با لە هەتاو**
**شەریکین لە زیزبوونی نازناز لە ئینجانەکانی وەنەوشە**

**تۆ شەریکی شەڕەکانی منیت لەگەل گۆرانی و وشەو خوا و ئازادی**
**شەریکی منیت لە خنکانی گەنجییەتیم لە ڕێگەکانی ڕۆیشتندا**
**شەریکمی لە بە باکردنی جگەرەکانی پەشیمانی لە سەفەر و گریانم لەگەل ئەستێرەکان**
**شەریکمی لە دروستکردنی تابووت و سپیکردنی سپیندارەکان بۆ جەلادەکان**
**شەریکمی لە نەزەرییەکانی ژیان بە چاوی پیاوکوژ و مەرگ بە دیدی خواناسەوە**
**شەریکمی لە تیۆری گولْ لە روانینی ئیرهابی و جەنگ لە بیلبلەی باخەواندا**
**شەریکمی لە شیکاری حیکمەت لە سۆمای جەنگاوەر و شەڕ لە دەفتەرەکانی فەیلەسوف**
**شەریکمی لە جوانی دەنگ لە گوێی راوچی و راوکردن لە نۆتەکانی کەمانژەنێك**
**شەریکمی کە تەنزیرمان ئەکرد ئەردەکانی جەهەنەم دابەشکەینە سەر فریشتەکان و بەهەشتیش بەسەر سەرخۆشەکاندا دابەشکەین..**
**شەریکمی لە گۆڕینەوەی زەمان و مەکانی گوڵەکان لە مەرکانەی وەختدا بۆ ئینجانەی ئاو و دەمی رووبار و کانییەکان**
**شەریکمی لە کارکردن لە گەل نابووتییەکانی ژیان و گۆڕینەوەیان بە جوانییەکانی فەنابوون**
**شەریکمی لە گۆڕینەوەی کەسکی گەڵاکانی وەفا بە بێڕەنگی حەقیقەت**
**شەریکمی لە گۆڕینەوەی سەرەتاکان بە کۆتایی**

**شەریکمی ئەیدۆست ئەی یار لە هەموو تاوانەکانی نێوان گوڵ و پەپوولە..**

**چراو باخچە ..**

**فڕین و رووبار..**

**باڵ و هاژە ..**

**شەریکین لە تێکەلاْو بوونی شتەکان بە ناشتەکان ..**

**لە تێکەلاْوبوونی فەنابوون بە مەرگەوە...**

**لە تێکەلاْو بوونی ژیان بە زیندەگییەوە ..**

**شەریکین لە نەمانی سنووری نێوان تاوانەکانی من و هێڕشەکانی تۆ**

**شەریکین لە نەمانی حەزی کێشکەکانی من و عەشقی پاسارییەکانی تۆ**

**شەریکین لە نەمانی تورەیی بای ئاسۆکانی من و گەردەلوولی دەلاقەکانی تۆ**

**شەریکین لە نەمانی ناسکی کەمەری نیسانۆکەکانی من و ئاوریشمی ناوقەدی ڕێحانەکانت**

**شەریکین شەریك ئەی شەریکی عومرو زیندەگی..**

**دەبیٚ بزانین ..**

**لە نێوان تاوانەکانی من و هێڕشەکانی تۆدا باخچەیەك هەیە هەردووکمان تیایدا نەمامی فەنابوون ئەچێنین**

**لە نێوان خۆشەویستی کێشکەکانی من و عەشقی پاسارییەکانی تۆدا ئاواییەك هەیە هەردووکمان فڕینی تیادا ئەکوژین**

**ئەبیٚ بزانین لە نێوان تورەیی باکانی من وگەردەلوولەکانی تۆدا ماڵێك هەیە هەردووکمان هەتاو لە ژوورەکانیدا کوێر ئەکەینەوە**

**ئەبیٚ بزانین لە نێوان نیسانۆکەکانی من و ڕێحانەکانی تۆدا باخچەیەك هەیە خاپووری ئەکەین..**

**شەریکین ..**

**شەریك ئەی شەریکی عومرو چارەنووس..**

**بۆیە وەك من ..**

www.dengekan.com
12/8/2006

**ناوێریت سەیری ئاسمان و بارانەکان کەیت**

**لە تەماشای پروشکەی بەفرانباری سینەو گەرمای تەموزی چاوەکان**
**ئەترسیت**
**لە ڕەنگی شیعرەکان ..**
**لە سنەوبەری هەناسە..**
**لە سێبەری لێوەکان..بزدیای...**
**ئەی شەریك ..**
**شەریکی شەڕو ..**
**شەڕی شەراکەت**
**بێهودەیە..**
**ڕێحانە کوژراوەکانت ..**
**لە نیسانۆکە شەهیدەکانی من جوداکەیتەوە..**
**بێهودەیە..، گۆڕی مەلەکانت ..**
**لە گۆڕی کۆترەکانی من قوڵتر کەیت**
**بێهودەیە مەرگی پاسارییەکانت لە مردنی کێشکەکانی من ڕازاوەتر کەیت**
**بێهودەیە حیکمەتەکانت لە کتێبێکی جیا لە کتێبەکانی گێلیی مندا چاپکەیت**
**بێهودەیە..**
**ئاسوودەگیت بە جیا لە بێزاری مندا بە ژیاندا بەڕەڵاڵاکەیت**
**بێهودەیە..**
**مردنەکانت لە ژیانی مندا بشاریتەوە..**
**بێهودەیە ..**
**ناوەکانت لە وێستگەکانی مندا بسڕیتەوە..،**
**بێهودەیە..**
**من وام لە گۆڕستانی شەهیدەکانت و تۆش وا لە ناو دەفتەری شانازییەکانم**

www.dengekan.com
12/8/2006

**من وام لە باخچەكانی برینی تۆ و تۆش وا بڵند لەگەل بەژنی شاتانەكانم**

**من وام لە نێو كەمانژەنەكانتدا دانیشتووم و تۆش وا لە نێو جەنگاوەرەكانمدا خەریكی دزیت..،**

**من وام لە نێو ئنجانەی گوڵەكانت و تۆش وا لە گەل دەستەكانمدا تاوان ئەكەیت..،**

**من وام لە نێو رۆژەكانی بەختەوەریت و تۆش وا لەگەل شەهیدەكانمدا ئەكوژرێیت..،**

**من وام لە نێو باوەشی ژنەكانتدا و تۆش وا لە نێو جەلادەكانمدا ماڵەكەت تالآن ئەكەیت..،**

**من وام لە نێو رووباری مردنەكانی تۆدا و..**

**تۆش لە فەناكانی مندا ئەخنكێیت..،**

**من وام لە نێو دونیای رووناكی تۆدا و ..**

**تۆش وا لە ناو تاریكی دونیای مندا بزر ئەبیت..،**

**من وام لە ناو تۆدا ..**

**تۆش وا لە نێو مندا..،**

**ئیدی ئێمە شەریكی دونیایەكین..**

**رەنگ و تام و بۆن و مانای .. وەك یەك وایە..، ئێمە لەیەك دونیاین..**

**لەیەك توخم و یەك رەگەزو ..زەیندااین..،**

www.dengekan.com
12/8/2006

تۆ زۆر جوان نیت..

خوێن شیرین نیت

من بۆیە عاشقتم

چونکە تۆش وەك من تەنیایت..،

* * *

من کێشەم لەگەڵ تۆ و خوا و وەرز و ساڵەکاندا نیە..،

کێشەی من تەنیا تۆی .. تەنیایی

* * *

من گۆرانی ئەڵێم و تەنهام..

شیعر ئەنووسم و تەنهام..

سەفەر ئەکەم و تەنهام..

من تەنهام .. من تەنهام.. وەك تۆ تەنها..

* * *

نە شوێنەکان .. نەکاتەکان..،

دەربازیان نەکردم لە تەنیایی

* * *

ئازادیش لە تەنهاییدا .. مردنە..،

* * *

بلا بێ رۆشنایی و شەوق بم

بێ کتێب و خوێندنەوە بم..،

لێ .. تەنها نەبم .. تەنها نەبم..،

* * *

عەشق .. هەوڵێکە بۆ دەربازبوون لە تەنهایی

نووسین .. سەفەرێکە بۆ خەلاس بوون لە تەنیایی

هەرچی ئەیکەم .. لە خۆکوشتن و کۆچکردن و عیبادەت

www.dengekan.com
12/8/2006

**بۆ قورتاربوونه له تەنیایی**

* * *

**هەندە تەنیام قەت ناگەمەوە تۆ..**

**هەندە تەنیام .. هەرگیز ناگەمەوە خۆ..**

* * *

**باخچەکان و شەقامەکان.. هەمیشە**

**وەك شەوەکانی ئەنفال.. باخچەکانی بارانی سێو**

**وەك من و ماڵەکەم .. غەرقن لە تەنیایی..**

* * *

**خیانەتی تۆ نەیکوشتم..**

**شتێك كە من ئەکوژێت.. تەنیاییە.**

* * *

**ئەتوانم زۆر شتت لێبشارمەوە..**

**تەنها .. تەنیاییم نەبێت**

* * *

**زۆر کەس .. زۆر شت نەیانتوانی داگیرم کەن..**

**لێ تەنهایی.. سووك و سانا زەوتی کردم..**

* * *

**تەنهایی خودایەکی بێڕەحمە**

**هەقی هیچ شتێکت بۆ ناستێنێ..**

* * *

**من و تۆ و تەنهایی .. ئاوێتەین**

* * *

**تەنهایی سەفەرێکە بێ کۆتا**

**گەمەیەکە بێ بڕانەوە..**

* * *

تەنهایی ، شەڕم لەگەل ئەکات..

عەشقم لەگەل ئەگۆڕێتەوە..

بەلأم جوودابوونەوە نزانێت..

* * *

تەنهایی، کتێبێکە ..شوێنێك نیە لێی دەستپێبکەیت..

یان بگیرسییێتەوە..،

* * *

من لە پیری هەڵنایێم..

لە مردن هەڵنایێم..

لە تەنهایی رائەکەم..

* * *

لەم لەحزەیەدا نەماچێکی دیکە

نە نووستنێکی قولْ ..

تەنیا مردن لەم تەنهاییە دەربازم ئەکا..

* * *

ئەگەر من شەڕێکم هەبێت، ئەوا لەگەل تەنیاییە.

* * *

سەیرە کە ئێوە هەست ناکەن تەنیان..؟

* * *

من تەنیاییم داوەت نەکرد ، ئەو خۆی هات

* * *

پردێك نەبوو لە پەڕینەوەییدا .. نەمباتە سەر تەنیایی

* * *

تەنیایی لێرەدا هەڵیقەنیم و هەر تەنیاییش هێنامییەوە.

www.dengekan.com
12/8/2006

* * *

لەپەنجەرەکەمەوە تەماشای ئەو دیو ئەکەم ..تەنیایی ئەبینم

* * *

# رەنگە پرچە سپییەکەت لە ناو گۆڕدا رەش بێتەوە..،

## بۆ مەرگی سەلمان کوڤلی



www.dengekan.com
12/8/2006

ئەمە يەقينێك نيە، مەرگت بمداتێ ..،
رەنگە گومانێك بێت.. تاووسيانە.. لە ئايەتەكان هەڵگەڕێتەوە..،
رەنگە مەرگت بۆ من .. خەمێكی سپی بێت..،
رەنگە بۆ تۆ.. باخچەيەك بێت پڕ لە گومان..
ڕێگايەك بێت پڕ لە پرس و دەرگەيەك بێت بەسەر بەرسڤەكاندا بكرێتەوە..،
رەنگە ..مەرگت.. بۆ من بزربوونی شاعيرێك بێت..،
رەنگە بۆ خۆت گەڕانێك بێت سەری سپيت تيايدا رەش بێتەوە..،
رەنگە بۆ خۆت .. سەيرانێك بێت..، تژی سترانی نوێ و پۆلێ وشەی باڵدار بێت،

كێ ئەڵێ مەرگت.. ژيان نيە بە مانايەك لە ماناكانی حەقيقەت..،
كێ ئەڵێ مەرگت.. نێرگزێك نيە بە وێنەيەك لە وێنەكانی باخچە..،
كێ ئەڵێ مەرگت شەپۆلێك نيە.. بە شێوەيەك لە شێوەكانی باران..،

رەنگە ئێستا.. تۆ.. وەكو باران جوان بيت..،
وەكو هەتاو بدرەوشێيتەوە..،
وەكو كتێب پڕ بيت لە ئايەتی رەنگاورەنگ و
رەنگيشە .. نا.. تەنيا .. وەكو جاران تەنها بيت..،

مەرگت لای من.. ئەبێتە هەوێنی شيعرێك و ..،
رەنگە بۆ تۆش.. نووسينێك بێت لە باوەشی .. ژنێكی رەشپۆشی ئەنفالدا..،
مەرگت لای من .. دەبێتە هەورێكی ئاوس و ..
رەنگە بۆ تۆش .. سەردانێك بێت لە گەل منداڵێكی بەهاری هەڵەبجەدا..،
مەرگت بۆ من.. ئەشێت ببێتە رەزێكی تژی رەنگ و رووبار

www.dengekan.com
12/8/2006

**رەنگە بۆ تۆش..، بیابانی مەرگی کاژەکانی ( سپیرێز )(1) و وەنەوشەکانی ( رۆستینکیٚ )(2)**

**من ناتوانم.. نە تۆ بخەمە ناو شیعرێکەوە و..،**
**نە مەرگیشت لە کتێبێکدا بنووسمەوە..،**

**من ئەمتوانی ..، لە پرچی سپیتدا .. ژیانێکی سپی ببینم..،**
**لیٚ لەمەرگی تۆ .. هەندە رەنگی.. ئاڵووالاو پرشنگدار ئەبینم..،**
**کە زەحمەتە ..، بتوانم..، ئەمجارەیان .. لە نیگای تۆ و ..، لە چاوانت و لە پەنچەکانت،**
**مانای شیعرێکی دی تێبگەم و بخوێنمەوە..،**
**کە زەحمەتە جارێکی دی ..، لەو مەرگەدا بگەڕێمەوە سەر تەعریفەکانی مردن..،**
**رەنگە مەرگت..، دەرسێك بێت لە هەرەسی دونیا..**
**رەنگە .. بەربوونەوەی عومرێك بێت بۆ بێنازیی..،**
**من ئەمگووت ( مردن لە تەواو بوونی گۆرانییەکی خۆش ئەچێت..، )**
**لیٚ رەنگە .. مردن هیچ سترانێك نەزانێت..،**
**من ئەمگووت مردن هەندە گەورە نیە لێی بترسیت..،**
**لیٚ رەنکە.. مردن لێنەگەڕێت هیچ بارانێك نەچێتەوە ماڵی خۆی..،**

**من مردنم نەناسی..،**
**من مردن ناناسم..،**
**من تەنیا ئێستا لە پرچی سپی تۆوە لە مەرگەوە ئەڕوانم..،**

**من نزانم ئەم زەمەنە خۆش بوو بۆ مردن..؟**

www.dengekan.com
12/8/2006

**یان زەمەنێك بوو.. لە مردن..؟**
**یان زەمەنێك بوو بۆ ژیان..؟**

**ئەمە چ پرسیارێکی بێهودەییە و..، چ هەوڵێکی بیٚ مفا..**
**کە من ئەمویٚ لە مەرگی تۆوە مەجرای دونیا بخوێنمەوە..؟**
**لە شێتیی ئەم گەردوونە تێبگەم و لە حاڵی مرۆڤ حاڵی ببم..؟**

**من رەنگە لە مەرگی تۆوە .. تێبگەم .. چ دەسکورتم .. چ نابووتم..،**
**نەفەلسەفەیەك .. نەخوایەك.. نە دینێك ناتوانێت خەلاسم کات..،**
**مەرگت رەسمی دونیاییێکم بۆ ئەکات پڕە لە نهێنی..**
**پڕە لە تێنەگەیشتن و .. گەڕانە بە دوای جاویدانی..،**

**من نازانم.. بۆ بەمەرگ دڵتەنگ بین..، کە جاویدانی شتێك نەبێت لە جوانی..؟!**
**من نازانم.. بۆ بەفەنابوون وێران بین..، کە ژیان شتێك نەبێت لە حەقیقەت؟**
**من تێناگەم..، کە فەحوای وجود لە لەحزەیەکدا ببیٚ بە ..با ..و کەمتر لە ..با..**
**بۆ لە خەمدا ون بین...؟**
**رەنگە مەرگ لە وێنەیەك لە وێنەکانیدا.. رەسمی دەربازبوونمان بێت لە شێتی..،**
**رەنگە مەرگ لە ئاوێنەیەك لە ئاوێنەکانیدا رەنگدانەوەی ئازادیمان بێت لە دونیا..،**
**رەنگە مەرگ لە پەڕێك لە پەڕەکانیدا.. ئاوریشمی نەجاتبوونمان بێت لە هەرەسەکانی هەبوون..،**
**رەنگە مەرگ.. لە کتێبێك لە کتێبەکانیدا تەواوبوونمان بێت لە یەزدان..،**

**رەنگە مەرگ.. لە سوچێکیش لە سووچەکانیدا.. فەنابوونمان بێت..، لە خۆماندا..،**

**کێ دڵنیایە..، کە مەرگ میهرەبانتر نیە..، لە دروشمی شۆڕش..؟**
**کێ ئەزانێ ..، مەرگ جوانتر نیە.. لە گەشانەوەی چاوی شیعر..؟**
**کێ ئەتوانێت مسۆگەر بێت..، کە مەرگ ئازیزتر نەبێت لە گەمەکانی ئازادی..؟**

**هەموو شتەکان..،وەك با .. لەم شعرەدا .. دێن و ئەچن..،**
**بایەك ..، کە نە هەژانەوەی من رائەگرن و ..، نە شتەکانی دیکەش ئەهەژێننەوە،**
**لەوە ئەچێت، نووسینیش جۆرێك بێت لە مردن..،**
**لەوە ئەچێت، خەمخواردنیش جۆرێك بێت لە مردن..،**
**لەوە ئەچێت، مەرگیش جۆرێك بێت لە مردن..،**
**لەوە ئەچێت، مردن هەموو شتێکی پێچابێتەوە و ئێمە ئاگامان لێنەبێت..**
**لەوە ئەچێت، ئێمە هەمووومان مردبین و پێمان نەزانیبێت..،**
**ئەو ژیانەش..، بێهودە ..هەموو ساتێك مردنەکانی خۆی ئەکاتە.. شعر و .. شۆڕش و .. زنجیرو .. ئازادی و تەنهایی..،**
**ئیدی رەنگە ژیان.. مردن بێت و .. مردنیش خۆی ژیان بێت..،**
**رەنگە مردن تەنها کتێبێك بێت .. هەموو کتێبەکان بپێچێتەوە..،**
**رەنگە مردن تەنها زەمەنێك بێت.. هەموو وەرزەکان لەو زابن..،**
**رەنگە مردن تەنها دینێك بێت.. هەموو پێغەمبەرەکان لەو هاتبن..**
**رەنگە مردن تەنها هونەرێك بێت.. هەموو شاکارەکان لەو رژا بن..**
**رەنگە دواجار.. هەر مردنیشە.. هەموو مەرگەکانی نەخشاندوون..،**

**هەر مردنە .. فێرمان ئەکات .. بۆ مەرگەکان بگرین و .. مردووەکانیش بلاوێنینەوە..**
**هەر مردنە فێرمان ئەکات.. نەفرەتی لێبکەین ئەویش پێمان پێبکەنیٚ..،**

**من ئەی کوڤلی..، لە کوێوە تەماشای مەرگ و مردن کەم..**
**رەنگە لە رۆژانی ( تاخیٚ کۆچەرا )(3) تۆ گۆرانیت بۆ ژیان ئەگووت و ئێستاش لە باوەشی مەرگدا هەر گۆرانی بۆ بڵێیت..،**
**رەنگە لەو (کێچخانەی)(4) بۆت ئەنووسی .. ئێستاش .. لەوێدا هەر بنووسیت..،**
**من تەواو.. نازانم.. مردن چی بوو..؟ و مردن چیە..و ئەبێتە چی..؟**
**رەنگە مەرگ.. تا سەر شتێك نەبێت..،**
**رەنگە ساتێك .. شەهید بوون بێت و ساتێکی کەش کوشتن..،**
**رەنگە ساتێك.. رووخان بێت و ساتێکی کەش هەڵسانەوە..**
**رەنگە ساتێك شۆرش بێت و ساتێکی کەش خۆبەدەستدان..،**
**رەنگە مەرگ هەموو شتەکان بێت..، هیچیش نەبێت..،**
**تەنهاو .. تەنها تەنیایی بێت..،**
**من نازانم ..، ئیدی بۆ لە خەمی مەرگی تۆدا.. وا دڵتەنگم..؟**
**کیٚ ئەزانێت ئێستاکە تۆ بەختەوەرنیت..؟**
**کیٚ ئەزانێت ئێستاکە تۆ ئازاد نیت و لە جارانیش شاعیرتر نیت..؟**
**ئەی من ناڵێم رەنگە پرچە سپییەکەت لەناو گۆردا رەش بێتەوە؟**
**کیٚ ئەزانێت .. رۆحی یاخیت ئێستا چ کراسیٚ ئەکاتە بەرو.. تا چەند هەڵئەفرێت..؟**
**کیٚ ئەزانێت.. چاوی ماندووت تا چەند خۆی دائەخات و چەند بە قوڵی لە خۆی ئەروانێت؟**
**رەنگە ئێستا .. جوانتر خۆت ببینیت..، جوانتر لە جاران..،**

**ڕەنگە ئێستا.. خۆشەویستتر خۆت بناسیت..، خۆشەویستتر لە جاران..،**
**ڕەنگە ئێستا .. لە باوەشی ئەو مەرگەدا.. خەریك بیت بڵێیت ( وەرنە مرنیٚ**
**(5)(**
**چونکە مردن.. میهرەبانترە لە ڤین...**

**ئای کە گێلم .. من کە باسی مردن ئەکەم و .. هێشتا نەمردووم..**
**کیٚ ئەزانێت .. تەعریفی مردن کات..، جگە لە مردوو..**
**ئێستا تۆ بۆت هەیە .. تەعریفی مردن کەیت..،**
**بۆت هەیە .. بڵێیت باسی زیندوان بۆ مردن.. باسێکە بیٚ مانا..**
**بۆت هەیە بڵێیت.. مردن ترسێکە .. ئازادیمان ئەکاتە وەهم..**
**مردن فتنەیەکە.. حەقیقەتمان ئەکاتە سەراب..**
**مەرگ هەمیشە سحرێکە بەتاڵ نابێت..،**
**مەرگ هەمیشە گزنگێکە .. ناگیرێت..**
**وەرزێکە پێی ناگەین بۆ ناسین..،**
**تۆش کە مردوویت .. پێمان پێئەکەنی و .. ئێمەش سەرسام لەبەردەم مەرگدا ئەگرین..**

**من نازانم بۆ ئەبێت مردن .. ئەوەندە سەخت بێت.. کە حەتمی بێت..؟**
**من نازانم بۆ ئەبێت مردن.. کۆتایی بێت..، کە هەموو شتەکان بەردەوام بن..؟**
**تۆ مردیت و منیش هەر خەریکم دەست لە ململانێی تریفە بم**
**( ڕەمەزان عیسا )(6) هەموو ئێوارەیەك بیرەیەك ئەخواتەوەو لەگەل ( سەلامدا**
**)(7) تاوڵەیەك ئەکات..،**
**( پەیڤێکی )(8) دیکەی کرچ و کاڵ دەرئەچێت و..**
**ڕەنگە ئەمجارەیان .. چەند فرمێسکە وشەیەکت بۆ بڕێژن..،**
**بێکارەکانی فکریش .. بە نووسینەکانیان خەو ئەکەنە کوچەکانی دهۆك**

شەوانی نووسەرانیش بەردەوام هزری تیا ئەخەوێت و دووشەشەکانیش
بەردەوام ئەمرن..

تۆ مردیت و دوو وێنەت لە خەیاڵی مندا جێهێشت
یەکیان وێنەی پیاوێکی خۆشەویست و
دووەمیشیان پۆرترێتێك ( ستار عەلی )(9) بۆی کێشاویت..،

ئیدی ئێستا تۆ لە سەفەرێکی بێ گەڕانەوەیت..، وەك سەفەری گومانەکان..،
کە لە وێستگەی وەڵامەکان نایەنە خوارو بەردەوام ئەڕۆن..،
ئیدی مەسافەکانی تۆ و گومان هەمیشە درێژ ئەبنەوە..،
درێژتر لە پرسیاری شعرو فەلسەفە..،

تۆش ئەبیتە گومان و .. هەندەیتر لە مەرگمان نامۆ ئەکەیت..
هەندەیتر .. لەبەرامبەر مەرگدا سەرسام و شەیدامان ئەکەیت..،
رەنگە ئێمەش ئەو دینسزەین..، کە ئیمانسزێکمان ئەوێت..، پێمان بڵێت..،
تۆ ئەی مرۆڤ..، تۆ چەند غەریبیت..، تۆ چەند دووریت لە زەمەن..،
تۆ چەند گێلیت..، تۆ چەند نامۆیت بە جێگاکان..،
تۆ چەند وەحشیت لەو بیابانی بێدەنگییەدا..،
تۆ چەند نەزانیت لەو دارستانەی سەمایەدا..،
تۆ مەحکومیت بە مردن..، تۆ مەحکومیت بە فەنابوون..،
بە سەفەرێك کە نیشانت ئەدات..
تۆ چەند بفڕیت..، هەر مەحکومی بە نیشتنەوە..،
چەندی بڕۆیت..، هەر مەحکومی بە گیرسانەوە..،
چەندی ئازاد بیت ، هەر مەحکومی بە گرتنەوە..،
چەندی عاشق بیت..، هەر مەحکومی بە جیابوونەوە..،

www.dengekan.com
12/8/2006

**ئەم سەفەرە پێت ئەڵێت.. ئەی گچکە خۆت**

**ئەی مەحکوم .. بۆ ئەبەد .. مەحکوم تا سەر .. بە عەدەم......**

**دیسیمبەری** 2003

**پەراوێزەکان:**

1. **چیایەکی شاری دهۆکە.**
2. **گوندێکە سەلمان کوڤلی لەویٚ لە دایك بووە.**
3. **گەڕەکێکی شاری دهۆکە سەلمان کوڤلی لەویٚ ژیاوە.**
4. **ناونیشانی شیعرێکی سەلمان کوڤلییە.**
5. **سەلمان کوڤلی دیوانە شیعرێکی هەیە بە ناوی (وەرنە ڤینیٚ )**
6. **رەمەزان عیسا، شاعیرێکی شاری دهۆکە.**
7. **سەلام بالایی، نووسەرێکی شاری دهۆکە.**
8. **پەیڤ، گۆڤاری یەکیێتی نووسەرانی کورد لقی دهۆك.**
9. **ستار عەلی، هونەرمەندێکی شێوەکاری شاری دهۆکە.**

12/8/2006



# پاڵەوانێك

پاڵەوانێك لە گۆشت

پاڵەوانێك لە خوێن

پاڵەوانێك لە روح

لە تۆی بێ بۆن و بێ رووبار و بێ هەناسە نووستووە.

جەلادێك لە میهر

جەلادێك لە رەنگ

جەلادێك لە عەشق

لە تۆی پڕ لە باخچەو خەون و خۆشەویستیدا بە ئاگایە.

www.dengekan.com
12/8/2006

# بێوەژنەکانم

2004/9/20



1
**ئیدی شەیدام هەمیشە دوای مردنیشم پەنچەرەکان بۆ ژیان بکەمەوە**
**دوای مردنیشم بەردەوام .. من وێڵم سەفەر بەرەو ئازادی بکەم**

من ئومێدی هەبونێك بۆ خۆم و ژن و دەسگیران و برادەر و ئاژەڵەكان ئەكەم كە
بە مردنی خۆشەویستان بێزار نەبن
كە ژنەكانم ئەبنە بێوەژن بتوانن بەردەوام گۆرانی بڵێن و .. هەمیشە پرچیان
بە خەنە بێت و بۆنی مێخەك لە ناو مەمكیاندا بفڕێت
هەمیشە لە دوای مردنەكانم ژنە خۆشەویستەكانم خۆشەویست بن و .. لە
گەل دەسگیرانەكانم باسی ماچ و مووچەكان بكەن
هەمیشە باوەش بە منی پیاو و ئامێزیان لە بۆنی من وەردەن
هەمیشە با بەو ئاقارەدا بفڕن كە ئەیانباتەوە سەر نوینەكانی بیٚ ئاگاییترین
سات و تێكەڵترین لە حزەی ژیان بە مەرگ و مەرگ بە ئازادی...
بیانباتەوە سەر جوانترین تەئەممول و خودترین ژن لە ساتەكانی مییێیەتیدا
دەبا هەمیشە ئەی ژنە جوانەكانم .. لەناو یەكدا تا دوا نوختە لێك دووربین و
تا دوا لەحزەش وێك نەچین
وێك نەچین و لەیەك نەچین و پێك نەچین و هاوبەش بین........

2

ئەڵێن دوای مردنی مێردەكان .. بێوە ژنەكان جوان ئەبن..
ئەمە راست بێت یان نە .. تۆ جوانتربە و عومرت بكە بە خەرمانەی بخور و
تۆزی نێرگز
پرچت بكە بە قەتران و سۆمات پڕكە لە شیعر و كلی رەنگەكانی چاوی
تاووس
وەك تریفە برژیٚ بەسەر هەوەسەكانی ئەڤین وجوانییەكانی دوای مردنم..

3

مردن هەوەسی بێوەژنەكان ناكوژێت
ئەی جوانتر لە رەنگەكانی ئازادی و شۆختر لە یاسەمینەكانی رەهایی

**جوان بە وەك ساتەكانی فڕین و كەوتنی جەستەی مەست بە بۆشایی شەهوەتدا**
**شل بە وەك ساتە بێهۆشەكانی بارین لە هەوەسدا**
**جوان بە ئەی شۆڕەژنی بالآتر لە جاویدانی ..**
**ژیان ... هەمیشە لە پەرچەمی تۆوە با برژێ**
**دونیا بەردەوام لە دیدەی تۆدا با بخەوێ و بێداربێتەوە..**
**تۆ هەمیشە خەون بە .. هەمیشە سەربەست......**

4

**ولآتی بێوەژنان هەمیشە پڕە لە پیاو**
**شەرمین مەبە و ولآتەكەت ڕەنگینتر كە لەوەی منداڵەكان ڕەنگەكانت لێ بسڕنەوە**
**پیاوەكانی ولآتی بێوەژنەكان هەمیشە لە تاریكیدا دێن و ئەچن .. هەمیشە لە شەودا وجودیان هەیە**
**بەردەوام وەك تارمایی ژیان ئەكەن.. بەردەوامیش بۆنی ڕێحان و قەنەفەر لە باخەڵیان تێكەل بە مێخەك و ئارەقەیە**
**پیاوێكن لەگەل بێوەژنەكان ئەبنە دوولەت لەتێك مەستی و لەتێك خەتا لەتێك ژیان و لەتێك عەدەم**

www.dengekan.com
12/8/2006

( تەئەمولێکی دی لە مردن.. پێشکەشە بە سەلام بالایی )

ئەو کاتانەی لە ژیان نزیك ئەبوومەوە من لە مردن هەڵئەهاتم و
کە لە تۆ ش نزیك ئەبوومەوە لە تاریکی هەڵئەهاتم

من نە بە پیری پیری و فەوتانەوە رۆیشتم و
نەدەستم بۆ باخچەیەك لە باخەکانی ئەم دونیایە درێژ کرد
هەمیشە دەستەکانم لە شتێکەوە ئەکشانەوە
هەمیشە چاوەکانم لە دیتنی بابەتێکا رایان ئەکرد
تەماشاکانم و پەنجەکانم هەمیشە لە هەڵاتن لە ساردییەوە گەرم ئەبوون
روحم هەردەم بە هەواوە بوو تا لە خاکەوە دووربێت و
هەردەمیش پێیەکانم لە بۆشاییەکانی ئەم عەردەدا رایان ئەکرد و لە شوێنێك نەگیرسانەوە
من لە خواو لە ئازادی و زۆر شتی رام ئەکرد و گەیشتمە باوەشی تۆ
من لە خەونەکاندا رام ئەکرد و تووشم بوو بە نووسین
من لە وشەکاندا هەڵئەهاتم و لە خوێندنەوەکاندا گیر بووم
ژیان هەلهاتنە
چوونێك، نەچووم بۆ ئەو چوونە
راکردنێك، نەمکرد بۆ باوەشی گەرمی وشەیەك یان ژنێك یان دونیایەك
ژیان لەوە سەیرترە بتوانیت تیایدا بە مەرگ بڵێیت زەحمەت نەبێت ئەم باخەم لێ مەشێوێنە
ئەم پیاسەیەم پێ تێکمەدە
ژیان لەوە زەحمەتترە گوێت بداتێ و پێی بڵێت
قوربان دە لێگەرێ با شیعرێك بۆ جوانی بنووسرێت و هەڵاتن نەبێت لە کرێتی..؟

**دەبا خەونێك ببینم بە ئازادی و لە رقی زنجیرەكان نەبێت؟**
**دەبا گۆرانییەك بڵێم و بۆ ئەوەنەبێت بێدەنگی پیێ بشكێنم..**
**دەبا خۆم بم ..وەك ئەوە نا كە لە خۆمدا ون بم یان ببم**
**دەلیَم گەڕێ با ساتێكی پڕ تەئەممول نەبێتە هەلأتن لە تورەهاتی**
**دەبا ماچێك نەبێتە هۆیەك بۆ بەردەوامی نابووتییەكان**
**چەند جوان ئەبوو گەر نووسیبام من بۆ هیچ نانووسم و لەبەر هیچیش نانووسم و با هیچیش منەت نەكا بە وشەیەكم و وشەشم منەتیێ نەكا بەسەر هیچا..**
**چەند جوان ئەبوو كە ماچم ئەكردی ئەوەم لە خەیاڵ نەبا بۆ ئەوەی نەمرم ماچت ئەكەم**
**بۆ ئەوەی كۆیلە نەبم ماچت ئەكەم**
**بۆئەوەی ماچت بكەم ماچت ئەكەم ..بۆ ئەوەی مرۆڤ بم و باخچە بم و شەوق بدەم ماچت ئەكەم؟**
**ئای كە سەخیفە ئەو ئازادییەی زنجیرەكانم لا ناشیرین و تەفروتونا و بیێ مانایەكی جوان ئەكات**
**ئای كە بێزاركەرە ئەو خۆشەویستییەی لە ترسی مەرگ و لە ناوچوونی پیاسەكان و پاسارییەكان و ئەم دونیایە رایەڵەكانی خۆی ئەخاتە ناو رۆحمەوەو لە بنمەوە تا سەرمەوە ئاوسم ئەكات بە ترس لە فەوتانی خەونێك .. مەرگی سنۆبەرێك .. تێكچوونی جێژوانێك.. خراپی گۆرانییەك.. لەنگی رووبارێك و رەشبوونەوەی رەنگێك و دڕانی كتابێك و فرمێسكی ئاڵی یان رەشی ئەزیزێك و ...**
**ئای... ئەزیزبوون، چ گرفتاریەكی گەورەیە ..و گەورەبوون چ گرفتاریەكی ئەزیزە.. ؟**
**من تێناگەم بۆ ئەبوایە كاروانی من هەمیشە راكردن بێت و بە پیرچوون نەبێت..؟**

12/8/2006

**من له ئێوه هه‌ڵدێم و شیعرتان بۆ ئه‌خوێنمه‌وه..**
**من له ئێوه هه‌ڵدێم و تریفه ماچ ئه‌كه‌م**
**من له ئێوه هه‌ڵدێم و به سه‌لمان كۆڤلییه‌وه ئه‌گه‌م**

**لێ ئێوه و تریفه و ئه‌م دونیایه‌ش، رامانێكن له هه‌ڵاتنه‌كانم**

**من به‌رۆحمه‌وه دیاره شیعریشم هه‌ڵاتنه له مردنم..**
**من خوێندنه‌وه‌شم هه‌ڵاتنه له مردنم**
**ژیاندۆستی و عه‌شقدۆستی و خۆشه‌ویستیم هه‌ڵاتنه له فه‌نابوون**
**من پێش ئه‌وه‌ی له‌سه‌ر خوانی جوانی ئێوه كۆببمه‌وه .. له تاریكییه‌كه‌وه هه‌ڵاتووم**
**پێش ئه‌وه‌ی بگه‌مه رووباری ره‌نگی ئێوه من له كابوسێكه‌وه هه‌ڵاتووم**
**پێش ئه‌وه‌ی بگه‌مه ماڵی ئێوه من له زیندانی شه‌قامێكه‌وه هه‌ڵاتووم**
**من هه‌ڵاتووم له خۆم و له رۆح و هه‌بونی خۆما .. ئنجا به قسه گه‌یشتووم**
**من هه‌ڵاتووم له خوا و كتێبه‌كانی ئنجا به تۆ گه‌یشتووم**
**من هه‌ڵاتووم له ئازادی و وه‌همه‌كانی ،ئنجا به حه‌قیقه‌ت گه‌یشتووم**
**من هه‌ڵاتووم .. له مه‌رگ و فه‌نابوونه‌وه .. ئنجا به ژیان گه‌یشتووم**

# باران

## بۆ زیبا



www.dengekan.com
12/8/2006

**بارانێکه له عەشق ئەچێ..**
**له چاوانت ، له مردن و فەنا ئەچێ..**
**بارانێکه .. تۆ بەمن و من به عومر و ..**
**مەرگ به  ئا زادی و**
**هەمووشمان به پیربوون تێکەل ئەکا**

**بارانێکه تەڕ تەڕ .. وەك سۆمای سووتاوت ..  بەرئەبێته هەور و**
**وەك وەنەوشه ئەبارێته سەر هەرێمی عەشق و نەمان..**
**بارانێکه وەکو راڤەی ئاسمان .. ئایەتێك له بخور**
**شەتحه ئەداته رۆشنایی رۆح..**

**باران رۆحه.. ئەیەوێ لەجەستەی هەورەکان جیابێتەوە..**
**باران هەتاوی خەیالێکه.. هەمیشه نامەی کورت ئەنووسێ**
**باران مەرگی فڕینی دلۆپێکه .. له تەنیایی**
**باران به ئاوبوونی هەناسەیەکه له گزنگدان**

**باران له گەوزینی رۆژگار ئەچێ له شەڕەکاندا**
**باران پیریی من و تۆیه..**
**رشانەوەی ترێیه بەسەر مێودا ..**
**شەڕابێکه .. شەڕی به مێوژبوونی دونیات بۆ باس ئەکا**

**باران ترسی شەڕەکانه له کۆتایی..**
**ترسی دونیایه له خۆی**

www.dengekan.com
12/8/2006

**باران قەفەسێکە ئاوسە بە فڕین**
**فڕینێکە .. بحالە .. بە زنجیر**

**باران .. باران، منە لەشەڕێکی بێ کۆتادا**
**لەگەڵ ئاو و بەفر و تۆزی هەبوون**

**باران تۆیت، بە عەشقێکەوە دەستی شکاوی جەستە و عاتیفە ئەگری..**
**باران، بەختەوەرییە لەگەڵ هەموو حوزنێکدا ئەباریێتە سەر خەراباتی ڕوناکی**
**باران ، چرایەکە .. سووتا بۆ تاریکی..**
**باران تاریکییەکە شەیدا بە ناخی خۆی**

**باران و باران و باران..**
**دەبباره .. وەکو غەزەب عەشق بکە دەستمەوە**
**وەکو خوا .. دڵم پڕکە لە شمشێری حەز..**
**وەکو شەیتان ڕۆحم پڕکە لە یاخیبوون**

**یاخی لە تۆ .. لە چەقۆیە تەڕەکانت و**
**گوڵە شل شلەکانت،**
**لە کەلەپچە هەوراوییەکانت و بروسکە ڕۆشنەکانت**

**تۆ تاریکترین قەترەی خۆتم پێ ببەخشە،**
**من بۆت ئەبمە دەریاترین ئافەریدە**
**تۆخراپترین گۆرانی خۆتم پێشکەش کە..**
**من لە زوڵماتی تۆ ئەموێ دونیا بە ڕووناکی ببینم**

www.dengekan.com
12/8/2006

**باران .. تۆ ببە بە من، بە چاوی من لە کاتی شەڕەکاندا،**

*** * * * * * ***

**باران ئەبێتە .. چیرۆکی ژنە خەمگینەکان..**
**ژنە خەمگینەکانی .. پیاوە خەمگینەکان..**
**ژنە خەمگینەکانی پیاوەخەمگینەکانی شارە خەمگینەکان..**
**ژنە خەمگینەکانی پیاوە خەمگینەکانی .. شارە خەمگینەکانی وڵاتێکی خەمگین،**

**باران چیرۆکی خەمگینی هەموومانە..**
**هەموومان بە خەمگینییەوە سەیری بارانە خەمگینەکان ئەکەین**
**کە ئەبارنە سەر کێڵگە خەمگینەکانی گیان**

**ئای باران .. چەند لە خەمی من و ژن و دایکم ئەچیت**
**چەند لە خەمی باوك و براکانم و ئامۆزاکانم ئەچی..**

**ئای باران چەند لە زیبا ئەچیت.. کە خۆی و خەونەکانی شەلاڵی ئاگرێکی خەمگین ئەبن..**
**ئای زیبا ئەو ئاگرە پێی وتم.. چەندی حەز ئەکرد باران بوایە.. کاتێ تۆی ماچ ئەکرد..**
**بارانیش پێی ویتم .. چەند خۆزگە خوازبوو لەم تەمموزە گەرمەدا رێی کەوتبا ماڵتانەوە..**
**ئای زیبا .. زیبای باران .. بارانیش لە تۆ ئەچێ..**
**لە خەمەکانی تۆ و گڕی پرچ و سینەت.**

بارانیش وەك تۆ. تەنها ئەڕژێتەوە رەحمی نەمان و لە هەڵم بووندا .. بۆ دواجار بیٚ ماڵئاوا .. سەر ئەکا بە مەرگدا..
ئای زیبا .. تۆ چیرۆکی کچە خەمگینەکانی.. خەمگینترین کۆلأنەکانی ئەم وجودەیت
تۆ خەمگینترین ناوی سەر کێڵگەکانی ئەم گۆرستانەیت
ئای چبکەم بۆ تەقویمێك بارانێکم بداتیٚ، وەك چاوەکانت لە گەشانەوەدا کوا سعاتێك .. میلەکانی بارانێکم بۆ ببارێنن .. چرك ..چرك.. شل شل بمکا بە یەك تاڵە موی برژانگێکی نەسووتاوت.
ئای زیبا، باران لە تۆ ئەکات، لە من ئەکات.. لە هەموو چیرۆکە خەمگینەکانی کۆلأنەکەماندا .. بە ئاگر بەرئەبێتە خەونەکانی تۆ و بە شعریش ئەڕژێتە ناو قەهرەکانی من.
بە حوزنەوە ئەڕژێتە ناو ئەشقەکانمان و ، بە عەزابیشەوە ئەرژێتە سەر مردنەکانمان.
ئای باران .. ئای زیبا .. ئای عەشق و فەنابوون.

* * * * * * *

ئەڕژێینەوە سەر بارانێك لە خۆم خەمگینتر و لە تۆ سووتاوتر..
بارانێك .. کە ئشتیای غوربەت لە خوێنیدا کەف ئەکات
بارانێك .. کە مەراقی غەریبی و کۆچ لە رۆحیدا سەمایەتی
بارانێك.. تەنك تەنك ئەبێتە هەور و تۆزی عەدەم بەسەر رۆحدا پەخش ئەکات
بارانێك لە بیٚ رەحمی ئەچێت..
وەك بیٚ رەحمی .. پیریی.. لەگەل ئەسپ و مرۆڤەکان
بیٚ رەحمی تەمەن .. لە پەپوولە

www.dengekan.com
12/8/2006

بارانێك لە ئاگری خەونە سووتاوەكانی تۆ ئەچێت..
لە هەموو شتێكی ناخۆش ئەچێت..

بارانێك كە هەمیشە لە ژیان ناچێت..
دێت و بەرئەبێتە خەونی زیباكان..

بارانێك وەك هەموو دڵەكان ..رەق .. رەق .. رەق...

## تریفە ژن

هەولێر 2005/11/7



من له بێدەنگی تۆدا ..چەند جوانم..
ئەی تریفه ژن..

* * * *

من له تۆدا
فێری عەشق نەبووم..
من له ژندا فێره میهرەبانی بووم
ئەی خودا

* * * *

دڵت له هێشووی ترێیەك ئەچێت
دەمیشت تاڤگەیەکی شەڕاب
من له کتێبەکانی تۆدا فێره بێدەنگی و شعر وخۆشەویستی بووم
ئەی ژن.

* * * *

له خوا فێره مەراق بووم و
له تۆوەش مێیانه خەم بخۆم
بۆژیانێك .. که نابێته پەڕینەوەی روحم
له چەپەری نێرگزێکەوه بۆ ماچێك
له دنکی هەنارێکەوه بۆ باوەشی دونیا..
له مردنەوه بۆ هەر شتێك..
هەر شتێك..له تۆ بچێ .. له کۆتر بچێ..
له گوڵ بچێ ....له من نەچێ..

* * * *

تا هەنگاو نەنێیت..

کەس بە شەل بوونی من نازانێت

تا دەستت بەرزنەکەیتەوە .. کەس بەگۆجی من ناحەسیێت

من لە چاوداخستنی تۆدا ..

ئەبینم

دەچاو بکەوە بۆ بینین

بینینی .. خاڵخاڵۆکێك خەریکە ئەفڕێت

وێنەیەك خەریکە ئەدوێت

من خەریکە ئەبمە هەموو شتێك و نابمە مرۆڤ

دەچاو بکەوە بەسەر هەقایەتەکانی پیاوەتیمدا

* * * *

من لە بێدەنگی تۆدا .. لە بێ ژنی تۆدا

جوان جوان و پیاو پیاوم

دەبدوێ و ناشیرینیم پەرشکە

ببە ژن و پیاوەتیم بوەشێنە

ئەی ژن..

ئەی کائینێك لە رۆح..

من لە تۆدا فێری عەشق و میهرەبانی بووم

نەوەك لە خوا..

* * * *

من لە بێدەنگی تۆدا جوانم و

**تۆش لە قسەکانی مندا ..مەخلوقێکی لەجەستە**
**بەقەد هەرمێیەك دونیا ئەگری و**
**بەقەد دڵێکیش خوێن ئەکەی بە دونیادا..**
**خوێنێك کە سەرمایەتە ..لە جوانی مندا و**
**لەبێدەنگی هزری تۆدا..**

* * * *

**فوێك بکە .. بەمەعریفەم..**
**تفێك بە زمانم**
**ئەی تریفەی ژن**
**من لە تۆوە فێری ماچ ئەبم**
**نەوەك لە خودا**

* * * *

**ئەی تریفەی شەنگەبی**
**بێوەژنانە بڕوانە روحی من و**
**با لەتۆوە خۆم ببینم ..**
**نەوەك لە خوا..**

* * * *

**لە مابەینی تۆو خوادا**
**من هەنارێکم پڕ لە سورەتی ژن و کائینێکم تژی لە تۆ..**
**لە بێدەنگی تۆدا جوان ئەبم و**
**دەنگم پڕ ئەبێ لە خوا..**

www.dengekan.com
12/8/2006

* * * *

له بێدەنگی تۆدا
من پڕم له تۆ..
له ماچ وریحان و پەرچەمت
پڕم له کەلەپچە و جەلاد
تا بە قسه ئاوس ئەبیت
من بارانانە
ئەبارێمە سەر مەمکەکانت و
خوا پێمنالێت تۆ ناشیرینی
تەنیا تۆ .. ئەتوانیت
بێیتە گۆ و
پێم بڵێیت
تۆ ناشیرینی ..ئەی کائینێك له پیاو
نەوەك خوا.

www.dengekan.com
12/8/2006

# ئەی کائینێك

2005/12/20



www.dengekan.com
12/8/2006

**من كەرانە لە تۆدا**

**لە عەشق و ژیان ئەگەڕام**

**گێلانە پرسیاری میهرەبانی و سۆزم**

**لێئەکردی..**

**من لە تۆدا .. ئەمویست ببم بە با..**

**بە باخچەی ئەوینێکی بیٚ کۆتا..**

**ببم بە ئاگری شعر و ..**

**تۆفانی خەیاڵ..**

**ببم بە بارانی ئازادی و**

**ریٚحانی هەقیقەت**

**من خەشیمانە لە تۆدا**

**پەیکەری خواو کۆتەڵی وەرزەکانم دا ئەتاشی**

**بێئاگایانە ئەمکردی بە ئەستێرە و هەتاو**

**ئەمکردی بە کچێك تژی لە مەمك و سێبەر و چرا**

**ئەمکردی بە فەنەرێك لە عەقڵ..**

**من کەرانە .. تەماشام ئەکردی**

**وێنەی خواو دەریا و گوڵەکانم تیا ئەدیتی**

**ئای لەو چاوانەم .. کە نەیانتوانی**

**تەنیا و تەنیا بە وێنەی**

**رووت و رووت و جوان جوانی مرۆڤێکەوە بتبینن..**

**نەیانتوانی بە وێنەی خۆتەوە بتبینن**

**کە تۆ باخچە نیت و ، بەڵکو کائینێکی**

**لە باخەکاندا چاوەریٚ ئەکەیت عەشق بتگریٚ**

**تۆ خوا نیت ، بەڵکو کائینێکیت لە کۆلآنێکەوە**

www.dengekan.com
12/8/2006

بە تەمایت دینێك ئازادت بكات..،
تۆ دەریا نیت .. بەڵكو ئافەریدەیەكیت
ئەتەوێت بارانێك تەڕ تەڕت كات،

تۆ لەم زەمەنە .. بێ رەسمەدا
ئەتەوێت هاوار بكەیت و پێم بڵێیت:
كەرانە تەماشام مەكە
ببینە من نەخودام و نە باران
نە چرام و نە بخور
نە ئەستێرەم و نە هەتاو
من تەنیا و تەنیا ژنێكم و
تۆش .. تەنیا و تەنیا پیاوێك
پیاوێك كە نەكوڕی خودایت و
نەچاوی عەشق..
نە پەریزادەیت و نە پەپوولە
تۆ تەنها پیاوێكی
عەشق هێشتا لە دەستت رائەكات و
میهریش خۆت لێ ئەشارێتەوە..،
هێشتانەكە كەرانە
ئەتوێ برژێیتە سۆز و میهرەوە
ئاونگانە ئەتوێ بە رووی هەتاودا بتوێیتەوە

تۆ .. كائینێكی بە دوای شتەكاندا ..
رائەكەیت و ماناكان ناگریت..،
تۆ لەوە ناگەیت .. تۆ تەنها پیاوێكی و

من تەنیا ژنێك..،
هەردووكیشمان تەنها .. كائینێكین لە مرۆڤ

من ئەڕۆم و نیازم نیە .. لە رووناكی بگەڕێم
من سەفەر ئەكەم و نیەتم نیە بخورێ هەڵكەم
من گوزەر ئەكەم و نامەوێ دینێك هەڵبژێرم
ئەڕۆم و ئاوڕ نادەمەوە لە هیچ و بانگی هیچ ناكەم..،
من كائینێكم دڵم تریانە
ئەگەر عەشق ویستی پڕم كات..
باوەك ترێ بڕژێتە ناوم
ئەگەر میهر ویستی تژیم كات
باوەك شەڕاب ببارێتە سەرم
ئەگەر خودا ویستی غەرقم كات
با وەك چرا وەرمپێچێ..

من كائینێكم تەنیا و تەنیا .. هەروەكو تۆ
مرۆڤێكم .. تەنیا مرۆ

كائینێكم جێگەم هەیە..
بۆ خوا .. بۆ عەشق.. بۆ ژیان
بۆ ئازادی .. بۆ گوڵەكانی رێحان

جێگەم هەیە..
بۆ تۆ ..ئەی كائینێك پڕ لە تەماشای گێلانە..،
كە كەرانە لەدەرەوەی خۆت

www.dengekan.com
12/8/2006

**ئەڕوانیتە چەمکەکان و ..**

**بۆ ساتێکیش ئاوڕ لە ناخت نادەیتەوە..**

**ئەی کائینێك لە ناخ..**

**لێگەڕێ .. با ناخت پڕ بێ لە خۆت**

**پڕبێ لە من ..**

**لە خۆتی تەنها پیا و و**

**لە منی تەنیا ژن....**



www.dengekan.com
12/8/2006

# ئوشا

2006/1/22-18



www.dengekan.com
12/8/2006

**ئەمشەو ئەكرێ ببین بە چی..؟**
**لەم شعرەدا روحمان ئەگا بە ساپیتەی كامە هەیوان**
**هەیوانی گوڵ .. یان هەیوانی یەكدی..**

**لە مابەینی من و تۆ و گوڵەكاندا .. شعرێك هەیە**
**بۆن ئەینوسێ نەوەك من و تۆ و گوڵ**
**لە نێوان من و تۆدا عەشقێك هەیە**
**من و تۆ نایخوڵقێنین .. گوڵێك ئەیكا بە بۆن و شعرێكی پێ رەنگ ئەكات**
**شعرێك ئەیكا بە رەنگ و گوڵێكی پێ بۆن ئەكات**
**من كێم لە تۆ زیاتر...؟**
**تۆ كێت هەیە لە من تەنهاتر و**
**هەناسە بخورتر ...؟**

**وەرە با پێكەوە لەو رەوە پڵنگانەی هزری مندا بفكرین و قەت منەتمان بە چ نەبێت**
**نە گوڵەكانی باخچە و نە كۆترە شینكەكانی خوا..**
**ئێمە چیمان هەیە لە جگەرە و ئازادی زیاتر ..**
**چیشمان ئەوێ بۆ ئەوەی جگەرە بكێشین جگە لە ئازادی..**
**بۆ ئازادیش چیمان ئەوێ جگە لە جگەرە كێشان**

**من و تۆ دوو وەحشی ئەوەندە جوانین كە لە شارێكی تەم گرتوودا نەبێت**
**ناتوانین نان بخۆین و**
**بەفر بگرین و هەنگاو بۆ خەراباتەكان بهاوێین**
**خەراباتی باران و ئاونگەكانی سەر روی یەكەمین پەپولەی گولاٌوی**
**ئاورینگی سەر پەڕی یەكەم تاوس كە ئەبێتە مەلیك و**

جوانتر لە مەلەك رێحان و هەموو شەيتانەكانى خوا..
وەك رۆشنايى و زەردەشت ئەرژێتە گيانى ئێمەوە..

ئاى ئوشا .. چەند لە روحى منەوە دوورى و روحم چەند خۆشى ئەوێى ..
ئاى ئوشا چەند بە غەريبى منەوە ئەنوسێيت و چەند مەيلم بۆت هەيە
ئوشا .. وەرە وەك تريفە برژێ بەسەر شەمايلەكانى دووگردمەوە..
نوێژم بۆ تۆ .. خودام بۆ تۆ .. عەشقم بۆ تۆ .. ئەى ئوشا
ئوشاى عەشق .. و فەنابوون لە خۆتدا..

وەرە من و تۆ با ببين بە شينێك لە شينەكانى ژن
وەرە با ببين بە سۆرێك لە سۆرەكانى گوڵ
وەرە با ببين بە رەشێك لە رەشەكانى بەهەشت
وەرە با ببين بە سەوزێك لە سەوزەكانى بەيارەكانى ئاڤێستا
ئەى هەتاو خۆت
وەرە و غەرقم كە لە تەنيايى .. لە دەسگيرانەكەمدا كە هەندەى تۆم خوشدەوێ
ئوشا ئەوم لە تۆ خۆشتر ئەوێ
ئەو لە تۆ ميهرەبانترە كە درۆكانم بڕوا ئەكات و ئەزانێت تۆم بزر كردووە
ئەزانێت تۆم بە جێهێشتووە
لە باخچەيەكدا جێمهێشتووى
كە وەفا ماڵى لەوێ نيە
كە ميهرەبانى بخورێك لەوێ هەڵناكا
ئوشا من تۆم جێهێشت تا ئەو لەگەل درۆكانى منيشدا بژى
بێ تۆ ئەى ئوشا ئێمە ژيان ئەكەين
وەك جۆگەلەيەك ئەرژێنيە ناو يەكدى
وەك بەفر لەسەر پێستى يەكديدا ئەتوێينەوە

www.dengekan.com
12/8/2006

وەك هەتاو روو ئەچینە خانەكانی یەكدی

ئای ئێمە دوو وەحشی چەند جوانین  لەگەڵ یەكدیدا
چەند بە میهرەبانی دەست و پلەكانی یەكدی رائەمووسین
ئێمە  بیٚ پرسیاری ماڵی قوربانی .. بیٚ پرسیاری گەڕەكی بەختیاری و قەڵای سەرسورمان
ژیانیٚ ئەكەین پڕییەتی لە ناز و راز و خەون

چۆنە وا تەنها تەماشام ئەكەیت
ئەی ئوشا
چۆنە وا میهرەبانانە لیٚم ئەڕوانی ئەی ئوشای جوان
چیە ئەتەویٚ بپرسی بەراست خوا كۆترە شینكەی هەیە..؟
بەراست تۆ جگەرە و ئازادیت هەیە..؟
بەراست تۆ دەسگیرانێكت هەیە لە گەل گوڵ و شعرا بەینی هەبێت ..؟
بەراست ئوشا تۆ ئەو پرسیارانە ئەكەیت و مەراقێك لە دڵی راستی خۆتا ئەكەیتەوە..؟
بەراست ئوشا .. یاسەمینێك چ پەیوەندی بە ئازادی و خواوە هەیە..؟
بەراست ئوشا من و تۆ چ پەیوەندیمان بە دەسگیرانەكەمەوە هەیە..
بەراست ئوشا من و تۆ و خوا چ عیلاقەمان بەیەكەوە هەیە..؟

ئای ئوشا ئێمە بێی تۆ چەند بەختەوەرین ..؟
چەند جوان لە كۆبوونەوەكاندا دەبین بە قەنەفر و قەتمەر ..
لە رۆیشتندا دەبین بۆ بۆنی مسك و عەنبەر..

**ئای لە ساتێکدا کە هەستم ئەکرد تۆ و حۆرییەکانی بەهەشتم لە باخەڵن،**
**ئەڕۆیشتم خۆم لە مەیدانێکی گشتیدا بتەقێنمەوە**
**ئەڕۆیشتم وەك ئەوەی هەزاران سواری .. ئەسپ رەش و سور و قاوەییم**
**لەدواوە بێت و ئالأیەکی پان و پۆڕی بڕوام هەڵکردبێ**
**ئاگرم هەڵکردبێ لەسەر دەستەکانم و بەرەو بەهەشت ملی رێم ئەگرت ..**
**ئەڕۆیشتم و ئەمووت ئێوارە لەگەڵ جوانترین پەری ئەوێدا لە سەر رووباری شیر و هەنگویندا خۆم رووت رووت ئەکەمەوە و لەناو مەمکی پەرییەکاندا بۆ ئەبەد خۆم ون ئەکەم**
**ئەڕۆیشتم و ئەمووت ئەچم وەك دەنکە هەنار بەسەر ماڵی پێغەمبەرا ئەتەقمەوە**
**ئوشا من لەشم پڕبوو لە تی ئێن تی و باروت و خەردەل و بۆنی پەریزادەکانی بەهەشت**
**لەشم پڕی نەفرەت بوو لە سۆزانییەکانی دونیا و حەز بۆ تێکەڵبوون لەگەل ژنەکانی بەهەشت**
**ئەو ژنانەی هەموو شەوان خەونم پێوە ئەدیتن و لە تەقینەوەیەکدا خۆیان بۆ رووت ئەکردمەوە**
**ئەو ژنانە .. ئای لەو ژنانە .. کە لەبەر چاوم ئەبوونە مایین و گوڵ و باران و رووبار**
**بە قایشێکی پڕ لە خەون و تەقینەوە خۆم بەستەوە .. پڕ بزمار و پڕ هەویر و پڕ شەهوەت**
**پڕ لە حەزی گەیشتنە یەکەم پەری لەبەر یەکەم دەرگەی ماڵەکانی بەهەشتدا**
**من حەزم ئەکرد ببم بە جیرانی ئەو پەرییانەی بێ شەرمانە بە بەرچاومەوە بە رووتی سەما ئەکەن**
**سەما بۆ من و پێغەمبەران و ئەسحابە رووسپییەکانی رۆژانی فتوحات**

ئای چ مەراقێکی گەورە بوو لە گەڵ ئەواندا شایی و گۆڤەندیێ بکەم کە هەموو پەرییەکان بە خۆمەوە سەرسام بکەم
ئای چ خەونێك بوو خوا پێم بڵێ ئەی کوڕی خۆم .. کوڕە چاو جوانەکەی خۆم .. وەرە لەتەکمەوە دانیشە و گازی جوانترین کچی خۆییم بۆ بکات و پێی بڵێت:
کچەکەم ئەمە پاڵەوانێکی منە لەمەرگ .. شەهیدێکە لە تەقوا ..
ئای چەند خۆش بوو منیش ئەو ساتە شەهوەت لە چاوانما ئەباری و بەبەر چاوی خواوە کچەکەی ئەوم رووت ئەکردەوە
چەند خۆشبوو شتێ نەمابوو کوفر بێت و خۆی لێ لادەم .. شتێ نەمابوو لەسەری بەشەڕ بێم و کوشتن بکەم..
ئەمووت ئەی خوایە گیان کوفرێ بکە بەم بەهەشتە تا جارێکی دی وەکو هەنار بتەقمەوە بەسەر جەستەی رووتی حۆرییەکاندا
هەتا خانە خانەم بچنە رووباری شیر و خوێنی پەریزادەکان
ئای خوایە گیان بمکەرەوە .. لەناو مەمکی حۆرییەکی سنگ سەدەفدا
لێرە هەموو شتێ هەیە و قورئان نیە
لێرە هەموو شتێ هەیە و نوێژ نیە
لێرە هەموو شتێ هەیە و رۆژوو نیە
لێرە هەموو شتێ هەیە و حەرام نیە
لێرە هەموو شتێ هەیە و خوا نیە

ئەمگووت ئەی جەیشی کوفر هاتم و بەسەر قەحپەترین ژنتانا وەکو لیمۆ ئەتەقمەوە
بەسەر ساواترین منداڵتانا کە ژەهری مەمکێك ئەخوا وەك دەبدەبە ئەتەقمەوە
بەسەر پیرترین پیاوی کافر وەك تریقانەوە ئەتەقمەوە

بەسەر گەنجێکی زەعتوت کە نە لەخەیاڵی خوایە و نەلەخەیاڵی ئیمان وەك
بورکان ئەتەقمەوە
ئەتەقمەوە و هەڵتائەگرم بۆ جەهەنەم

ئوشا من ئەڕۆیشتم و وامئەزانی تۆش وەك پەرییەکان لە باخەڵمای
نەمئەزانی لە ساتێکدا پەرییەکان ئەبنە ڕەژوو و تۆش ئەبیتە قوربانی
نەمئەزانی حۆرییەکان ئەبنە سۆزانی و منیش جەلاد
نەمئەزانی ئوشا بەناوی تۆوە چ تەور وەشێنێکی بێزەوەرم
بەناوی تۆ وە چ مەخلوقێکی دڵرەقم
من خەریك بوو لەناو خوێنی تۆ دا ئەگەوزام کە زانیم من چ قوربەسەرێکی
غەریزەییم
ئای غەریزە .. ئای ئوشا .. ئای شەهوەت و بەهەشت
دین و کچ و خوێن و قەترە قەترەی شتەکان

دڵۆپ دڵۆپ ئەرژامە سەر منداڵ و پیاو و ژن و ئەم ژیانە
هەستم ئەکرد ڕۆحم هەلا هەلا ئەبێت و لە ناو سینگ و مەمك و پەنچە و لێوو
قژ و چاو و تفدا ئەتوێتەوە
هەستم ئەکرد ئەبمە پرتەقالێك و دەستێك ئەمگوشێت
ئەبمە دڵۆپە خوێنێك یەکێك فوم لێئەکات
ئەبوومە قەترە بارانێك و ئەباریمە سەر دوکەڵێکی بێڕەنگ
ئەباریمە سەر شعرێکی ( هەندرێن ) و
ئەبارێمە سەر قژی تەڕی سۆزانییەك کە پێی ئەگووتم ئای غەریب لەخۆت
ئەمریت و دەستێکم ناتگاتێ دەستپەڕێکت بۆبکات
شەوێك ناتگاتێ پێکەوە کۆمانکاتەوە
سێبەرێك ناتگاتێ بەیەکەوە فێنکمان کاتەوە

ئای غەریب لەخۆت کە ئەمریت و پەریەك نیە سێکست لەگەل بکات
کچێکی بەهەشت نیە پشتت بشێلیٚ

ئای ئوشا چ ساتێکی زەحمەت بوو لەنێوان کوشتن و نەمردندا
چ ساتێکی کوشندە بوو کە تۆ کەمتر لە چرکەیك ئەبوویتە بەهەشت و
ئەبوویتە دۆزەخ .. ئەبوویتە پەری و ئەبوویتە سۆزانی
چ چرکەیەکی کوژەك بوو
کە تۆ ئەبوویتە دڵی من و ئەبوویتە دوا کیژی دونیا و دوا وشەی
خۆشەویستی
چ کوشندە بوو
کەمتر لە با ئەجووڵایتەوە و ئەبووی بە شنە
کەمتر لە خوێن ئەبوویتە قەترە و ئەرژایتە جەرگمەوە
ئای ئوشا تۆ ئەبوویتە هەموو شتێك و ناشبوویتە هیچ
تێکچووم ئوشای من .. عەزیزم تێکچووم
نەمزانی من پڕم لە چی
خەون و خولیای بەهەشت
یان حەزی تەقینەوە بەسەر دواهەمین دین و دونیادا
نەمزانی بەتاڵم لە چی
لە شعر و وەنەوشە
یان لەژن و ماچ
نەمزانی ئاوسم بەچی
بە کۆترە کیوی و قاقای منداڵیم
یان بە نرکەی دوا ساتەکانی مردن
نەمزانی من لە چی ئەگەڕێم

www.dengekan.com
12/8/2006

**لە تۆ ، لە بەهەشت یان لە لەشی خۆم**

**نەمزانی من چیم ئەویٚ.. رۆحی تۆ یان روحی خۆم یان روحی خوا..**

**بمبورە ئوشا، ئوشای جوان بمبورە**

**من نازانم بۆ ئەبوایە بەو هەموو باڕووتەوە خۆشترین مەخلوقی ئەو زەوییە نەبام**

**بۆ بەو هەمووخەونانەوە بەتامترین کوڕی ئەو گەردوونە نەبام**

**بۆ من جوانترین کوڕی خوا و هەتاو و باران و نێرگزەکان نەبووم**

**بۆ من عاشقترین پیاوی ئەم هەوایە نەبووم**

**بۆ ، بۆ ئوشا ، بۆ ..**

**من ناتوانم نە لەتەقینەوە و نەلەنەمردن و نە لەنوێژەکاندا بتگرم**

**بۆ ناتوانم لەگەل تۆدا پیاسەییٚ بۆ بەهەشت و بۆ جەهەنەم بکەین**

**بۆناتوانم وەك عاشقیٚ دەستم بخەمە بن باڵتەوە و هەر بەدەم ماچ**

**تا سەر کەنارەکانی گاتایەکەوە بچین**

**ئای ئوشا من غەریبم کچیٚ من غەریبم**

**غەریبتر لە گۆرانییەکانی دەروێشێك بۆ خوا**

**غەریبتر لە وشەکانی خوا بۆ کچەکانی**

**غەریبتر لەو خوشکانەی ناتوانن تەماشای چاوی براکانیان بکەین**

**غەریبتر لەوانەی لە پێش مندا تەقینەوە و نزانم بۆ کویٚ رۆیشتن ..**

**ئای ئوشا**

**ئەو دەردەی من چەند گرانە**

**گرانتر لەدەست لێکبەردانی حەیرانەکان و چیرۆکی عاشقەکان**

**گرانتر لە بارینی باران لە ئاسمانی ساماڵدا**

www.dengekan.com
12/8/2006

**گرانتر لە خۆت ئەی ئوشا**

**نە تۆ نە خوا .. غوربەتی من ناکەنە دەسکە ریحانێك و بە پەرچەمی**
**جارییەکدا شۆڕ ببمەوە**
**ئیدی من تەواو لە غەریبیدا بۆ دوا جار ئەتەقمەوە و وەك بارانێکی غەریب**
**ئەڕژێمەوە ناو منداڵدانی دایکمەوە..**
**ئیدی من تەواو غەریبانە لە چایخانەیەکی غەریبی ئەو هەبوونەوە فڕ فڕ ئەبمە**
**هەڵم و نامێنم**

**ئیدی تەواو ئوشا من تەواو .. من لەتۆدا و لە بەهەشت و شەهوەت و خوا و**
**باخچەکاندا تەواو**
**من لە مەکتەب و برادەر و کچەکاندا تەواو**
**ئیدی بەهەشتیٚ نەما من بۆی ببمە قوربانی..**
**من ئەمەویست ئەو غوربەتەم لە بەهەشتدا لە ناو مەمکی رەشترین حۆریدا**
**بکەمە چیرۆکێك پەرییەکان بۆ خوای بگێڕنەوە**
**من بەتەما بووم بەهەشت بکەمە ماڵی حەزەکانم و کەسیٚ نەبێت میزاجم**
**تێکدات..**
**ئای ئوشا من بڕوام کرد تۆ لەوێیت و لە و مەیدانە قەڕباڵغەدا چاوەڕێم**
**ئەکەیت تا بێم و ئەویٚ بکەم بە گوڵناری تەقینەوەیەکی پڕ لە فۆسفۆری**
**نارنجی و ئاگرێکی وەنەوشەیی..**
**من گووتم تۆ لەویٚ لە ناو چاوی کچەکان و عەبای ژنەکاندا .. سەرێکم لیٚ**
**خوار ئەکەیتەوە و بە وێنەی فریشتەیەکی رووت سلاٚوم لێئەکەیت و منیش**
**پت ئەنێم بە دوگمەی مردن و ئەو ناوە ئەکەمە چل چرای مەرگ و باخچەی**
**مەردن و شەقامی فەنابوون..**
**من چاوەڕێبووم تۆ لەویٚ بیت و پێم بڵێیت : ئافەرین ئەی کوڕی خوا..**
**ئەسحابەی ناو شارە بۆگەنەکان**

www.dengekan.com
12/8/2006

تۆ بۆنی بەهەشتت لێدێ .. رەنگی جوانترین شەهید لە جەستەتا ئەڕژێ ..
هەناسەت رۆشنایی بە رۆژ ئەبەخشێت..
ئافەرین .. تۆ وەك ئەو گەنجە سەخیفانە نەبوویت خۆت بە مۆسیقا و
هونەرەوە مەشغولێ کەیت
وەك ئەو کوڕە سەقەتانە نەبوویت فێرە نامەی دڵداری و مەسیجی عەشق
بیت..
ئافەرین.. کوڕی بەوەفای جیهاد..
تۆ هەرگیز لە خەمی ئەوە نەبوویت.. لە ماڵی دونیا سەرگەرمی گەمەیەك بیت
عەزیزم ئوشا.. تۆم نەدی تا لەوێوە سەرگەمانەتر پل بنێم بە مەرگدا و ئەم
مەیدانە بکەم بە تەنبورخانەی فەنابوون
تۆ لەوێ نەبوویت و منیش رارا دڵم لە لێدان ئەوەستا .. رارا خوێن لە
جەستەما ئەبوو بە
تەنها ئاوێك و دیدەم لە سەر کەمانچەی خوێندکارێکی هونەرە جوانەکان
وەستا...
ئای ئوشا ئەو ساتە چ کوشندە بوو
ئەو ساتە چ عەزابێك بوو .. کە مەست بووم لە بێ یادەوەریدا ..
لە دوورەوە لە دوا نوقتەی گیانمەوە .. دەنگێك وەکو لەرەی عودێك هاتە
رۆحم ..
دەنگێ وەکو قاسپەی کەوێ هاتە بەر گوێم ..
بۆنێ ، وەکو نێرگز هاتە لووتم
تیشکێك وەکو گڵۆپە زەردەکەی حەوشەمان هاتە چاوم

دونیا هەمووی بە رەنگی نارنجی کەوتە خوێنمەوە..
تۆ دیار نەبوویت.. نەمئەدیتی
بە وێنەی کۆتریك ، یان مامزێکیشەوە دەرنەکەوتی

www.dengekan.com
12/8/2006

**من ئەوساتە لە بۆشاییدا بووم لە دڵی خۆمدا گووتم.. ئوشا پەشیمانم .. لەم دیمەنە .. پەشیمانم کە تۆ نابینم**
**کوا تۆ لە کوێی ئەی وشەی خوا .. ئەی بەهەشتی راستی من .. ئەی ئوشا**
**کوا تۆ لەکوێی من لەرەی دەنگی تۆم پێویستە نەوەك خوڕەی رووباری شیر ..**
**من هەنگوینی لێوی تۆم پێویستە نەوەك تامی ئەو دار قەسپە شیرینانە..**
**ئای ئوشا عەزیزم تۆ لە کوییێت..؟**
**دەنگت نەبوو رەنگت نەبوو ..**
**من وەك تارمایی شەهێدێك لەو ئاپۆرایەدا ئەسووڕامەوە کە من دروستم کردبوو..**
**بەدوای تۆدا ئەسووڕامەوە**

**کە بینیم لە لای راستی پرتەقاڵ فرۆشێکی بێ دەست و پێ وەك نێرگزێکی چرمسی کەوتبوویت..**
**لەولاوە نوزەت هات و لای ئەو مناڵە ساوایە وەنەوزت ئەدا کە ئەو دەمێك بوو گەیشتبووە باوەشی خوا..**
**لە لای سنەوبەرێکەوە بانگت کردم کە هەردوو چاوەکانت ئەبڵەق ئەبڵەق بڕیبوونە ئەو تەرمەی لە بەرامبەرتا هەلا هەلا راکشابوو..**
**ئای ئوشای من .. عەزیزم**
**لە دواجاردا من تۆم لە ناو خوێناوی جەرگ و دڵی تێکەڵاوی خۆمدا دیتەوە..**
**غەریبانە وەك کۆترەکانی ئەو ناوە و مرۆڤەکاندا گیانت دابوو..**
**غەریبانە وەك من ببوویتە قوربانی**
**من ئەو ساتە غەریبتر لە هەموو ساتێك .. غەریبتر لە تۆ و هەموو خەلیاقەتەکان**
**زانیم ئەی ئوشای عەزیزی من، تۆ قوربانی منیت و منیش جەلادی تۆ ..**
**منیش هەمدیسان قوربانی تۆ و تۆیش جەلادی من**

www.dengekan.com
12/8/2006

**من قوربانی کتێبێك بووم بە ناوی ئیمان**
**قوربانی ئیمانێك بووم بە ناوی بەهەشت**
**قوربانی بەهەشتێکیش بووم بە شەهوەت**

**ئەی شەهوەت .. ئەی ئوشا .. ئیدی من نەمئەزانی لەو گەمەیەدا تۆ تەنها**
**شەهوەتیت و لە غەریزەمدا بەهەشتم بۆ ئەکەی بە حەشاماتی پەریزادان**
**ئوشا .. تۆ لەوە زیاتر نەبووی .. کە ژیانت بۆ کردمە تەنها رژانی قەترەکانی پیاوەتیم**
**تۆ لەوەزیاتر نەبووی کە مەرگت بۆ کردمە تەنها رژانی قەترەکانی پیاوەتیم**
**ئیدی ژیان و مەرگم .. ئەی ئوشا .. لە تۆدا بوونە هەم جەلاد و هەم قوربانی**

**ئیدی من تەواو .. ئەی عەزیزم ئوشا .. من تەواو لە ژیان و لەمردندا تەواو ..**
**تۆش لە مندا بە وێنەکانی دیکەدا تەواو ..**
**تۆ وەك گوڵ تەواو ..**
**وەك بەهەشت تەواو**
**وەك خوا و هەتاو تەواو**
**تەواو وەك خۆم .. وەك خۆت تەواو.........**

www.dengekan.com
12/8/2006



# پیاوی بیٚ ژن و
# خوای دوای ئەنفالەکان

2006/4/17

**تۆش وەك ریٚحانەکان هەناسەی باخەوان تیٚکەلٚ بە خاك و باخچە ئەکەیت**
**تۆش وەك ( با ) ئەباریتە ناو باخەلٚی ئەم گەلاٚ دلٚدارانەوە و ماچی هەورییان پیٚ ئەبەخشیت**
**وەکو باران ئەفڕیت بەسەر مالٚی لیمۆیە عاشقەکان و مەمکیان ئەخەیتە ناو پەنچەی ڕەنگەوە**
**تۆش جوانبە .. ئەی کوڕی هەتاو .. وەك سیٚبەر**
**تۆش فیٚنك بە وەك حکایەتی عەشق**
**دەنگیٚك با لەتۆوە بۆ ژیان بڕژیٚ بەسەر گەلاٚکان و جۆگەکاندا**
**پڕشنگیٚك با لە لیٚوانتەوە وەك کوریکەی هەنارەکان بخزیٚتە پەنجەکانی منەوە**

دڵخۆشبە ئەی کچی شەنگەبی لە نێو دەستی بارانێکی عاشقدا
دڵخۆشبە ئەی بەژنی قەتمەر لە ژوانی بۆن و رەنگی تریفەدا

بڕژێ .. بڕژێ بەسەرما وەك خەون داگیرم کە
وەك شعر پەرشمکە لە نێو زمانی گیا و حەرفی مێکوك و پنتی حەوزێکی پڕ خەیاڵ
ئەی بەژنی روناکی لە تاریکاییمدا داگیرسێ ..

* * * * * *

لە خامۆشیدا رووناکی دەست ئەخاتە ملی تاریکی  و تاریکیش ماچی ئەکات
ئەوانیش ئادەمیانە تێکەڵاوی یەك ئەبن و لەناو یەکدی فەنا ئەبن
لێ زەمەن نازانێ لە ترسانە یان لە خۆشەویستی..؟!

پەلکێك لە داری ئەنفالەوە هەناسەی خوای تێدا وشك ببوو
گەڵایەك دەنگی خوای پێچابۆوە و بەو گوندەدا وەرببوو

دارێك پەنچە بێ رەنگەکانی خوای لەناو مەمکە وشکەکانیدا هەڵگرتبوو
رەگێك رووباری شیرێکی وشکەوەبووی بەهەشتی لەخورجینەکەی خۆیا بۆ خوا هەڵگرتبوو
تۆ بیرکەرەوە ئەی پیاوی بێ ژن

www.dengekan.com
12/8/2006

# زۆر جار لە بێزارییەوە

# خۆشم ئەوێی



www.dengekan.com
12/8/2006

**له برینێك ئەگەڕێم بتئێشێنێ**
**له جوانییەك ئەگەڕێم بتخواتەوە**
**له سوخمەیەك مەمکەکانت بشارێتەوە**
**ئەی رۆح خۆت .. ئەی تەبارەك خۆت**

**خەونم تۆی هەندێجار کە بەرووتی نوێژێکی مەستانە ئەکەیت و کەس نابینیت**
**خواش نابینیت..**

**ئازارم تۆی هەندێجار کە مەستانە بۆ خوا ئەگرییێیت و دووگردەکان ئەسووتێنی و فوو لە خوێنم ئەکەیت**

**عەشقم تۆی هەندێجار بەو هەموو برین و جوانی و خۆزگانەوە .. پێئەکەنی و شێتانە باسی من ئەکەی هەروەك ئەوەی باسی پیاوێکی وەحشی ئەکەی..**

**خوێنم تۆی هەندێجار رووسورانە لەبەرامبەر پەلکە مێویَ دائەنیشی و باسی باران و مێکوك و هەور و سەراپای ژیانی خۆتی بۆ ئەکەی..**

**چیرۆکم تۆی.. هەندێجار شێواوانە شعر ئەڵێیت و لاکێشانە جگەرە ئەکێشیت و تەڕ تەڕ وەك هەورێکی بارگران لە بن باراندا بناڵێنی خۆت ئەکەی بە بن جەستەمدا**
**من و تۆ و دووکەڵی جگەرە و باران .. رووت رووت  بە ناو یەکدیدا بۆ ئەبەد روو ئەچین..**

هەندێجار نا کەمجار ئەبیتەوە ئەو چرا تاریکەش کە حەز لە رەنگ و رووناکی ناکات

کەمجار ئەبیتەوە ئەو دەریایەش حەز لە زەوی ناکات

کەمجار ئەبیتەوە بەو ژنەش حەز لە من و جەستەم ناکەی

کەمجار کەمجار .... ژنایەتی و خوێن لێك ئەتۆرێن وشەهوەت و ژەهریش وەك یەك نارژێن

کچێ لێگەڕێ با ئەوقسە قۆڕانە شاعیرێك بیکات کە هیچ لە تۆ نازانێ

کە هیچ لەو مەمکانە نازانێ

کەهیچ لەو خوێنە نازانێ

کەهیچ لەو گوشینە نازانێ .. کەهیچ لەو مژینە نازانێ

لێگەڕێ با ئەو باس جوانی بکات و ئێمەش جوان بین....

قوربانت بم

بۆچی نا .. دڵۆپ دڵۆپ لە باخێکەوە نەبمە ژەهر و لەسەر پشتی پەپوولەیەکەوە بتبمەوە ماڵی دووپشکێکی پیر

بۆچی نا ، لە سارایەکدا نەبمە شەهوەت و بەر ببمە گیانی لم و... زەوی خۆی تاوبدا..

بۆ چی نا.. دەریا بەدوام نەگەڕێ و داوا بکات زەوی چۆڵکەم

دەبا چۆڵیکەین ئەم زەوییە جوانە بەکەڵك ئێمەوە نایەت

ئێستا زەمەن بەدەستی سعاتەکانەوە نیە..

ئێستا رەنگی شوێن بەدەستی وەرزەکانەوە نیە

**ئێستا تەنیامن و تۆ ئەتوانین .. لەو سەر زەوییەدا بە ئازادی جگەرەیەك بكێشین و لە ژوورە تاریكەكەشماندا بیّ جلك بنووین و تێر تێر تەماشای یەكدی كەین و بەیەكەوە پێبكەنین وەك ئەوەی دوو شێت لە ژوورێكدا یەك ماچ ئەكەن؟**

**دە لێگەڕیّ قوربان ئەوەشیان بۆ رۆماننووسێك لێگەڕیّ كە زۆری حەزی لە مۆسیقایە و حەزی لە كچە و حەزی لە ڤینۆیە و حەزی لە من و تۆشە..**
**لێگەڕیّ وەك ئەم دوونیا بیّ سەروبەر و جوانە، ئێمەش قژمان بدەینە دەست با و باش بدەینە دەست دڵمان**
**رووناكیش بدەینە دەست رۆحمان**
**لێگەڕیّ ئەو مەملەكەتە بیّ ئێمەش هەر جوان و رازاوەیە وەك شەوەكانی رێحان**
**وەك ئاوازەكانی شالوور**

**لێگەڕیّ ئێمە رەسمێكی وامان نیە بیدۆڕێنین و رەسمێكی واش لە دونیادا ببەینەوە**

**دەبا بڕۆین بەو هەموو جوانی و برین و عەشقەوە بڕۆین**

**كەمجار هەیە جوان جوان وتەڕ تەڕ و نەرم نەرم و شتی تر بیت.**
**ئیدی زەحمەتە من تۆ و جوانی و نەرمی و تەڕی و شتی دی پێكەوە كۆببینەوە.**
**هەمیشە مەسافەیەك .. هەمیشە ترسێك .. هەمیشە رێگرێك .. هەمیشە جوداییەك لە نێوان من و تۆدا هەیە و ئەو نەبێت ئێمە عاشق نابین..**

www.dengekan.com
12/8/2006

**هەمیشە کتابێك و هەمیشە باوەڕێك و هەمیشە مەبدەئێکیش لەنێوان من و تۆدا هەیە و ئەو نەبێت ئێمە ئەبین بەیەك**
**هەمیشە لە نێوان من و تۆدا خوێنێك .. خوایەك.. هەتاوێك هەیە .. کەوامان لێئەکات بڕژێین بەسەر یەکدا و یەکدی ڕەوانەی جەهەنەم کەین**
**بڕۆ تۆ زۆر جار ڕۆیشتیت و .. منیش کەم جار چاوەڕێم کردوویت و زۆر جاریش گەڕاویتەوە و زۆر جاریش دەستت پێکردۆتەوە..**
**بڕۆ من و تۆش لەو زەوییە جوانتر نین ڕۆژانە پێی لێ ئەنیێن .. من و تۆ لەو تاریکییە بەزەوقتر نین بە چرایەك میزاجی خۆی ئەگۆڕێ**
**بڕۆ تێکەڵی ئادەمییەکان نابین ئیدی**
**با لەگەل باران و خوا و گوڵ و ئەستێرە و هەور و چرا و گزنگ و هەناسەی ئەو کەونە گوێ لە خۆمان بگرین بە ڕوووتی**
**تەماشای خۆمان بکەین لە قاقادا**
**بگرین بەسەر ڕۆحماندا لەکاتی گەشانەوەی لەگەل ئێمەدا..**
**با بڕۆین گیانە ئێرە بە کەڵکی ئێمە نایە زۆر جار**
**کەمجار ئەڕۆین .. با بێ سوخمە هەڵتبگرم و بەو باخانەدا بتگێڕم و نیشانی باڵندەکانت دەم**
**هەرچی حەزی کرد با مەمکت ماچ کات**
**با بڕۆین و بەرووتی هەڵتگرم و بە پێکەنینەوە**
**من پێت بڵێم چەند بێ مانایت..**
**تۆش بڵێیێت چەند بێ مانایت..**
**.. ئەی ئەی ئەی ی جوانی چەند بێمانایت..**

**زۆر جار من لە بێزارییەوە خۆشم ئەوێیت.**

www.dengekan.com
12/8/2006

**راپێچم كه ئەی مەیئوسترین بای عەدەمی میهرەبان**
**راپێچم كه بۆ جەهەنەمی ماچەكان و بۆ پێدەشتی ئاوێزانی**
**راپێچم كه ، تاریكترین ساتی خوێنم بۆ تۆ**
**راپێچم كه،  ئەی سووتاوترین رێحانی ترس**

**ساتێكه كوژانەوەم لە ناو تۆدا**
**عومرێكه چرات لە روحی مندا**
**من لە نێوان تۆ و خۆمدا .. عەترێكم مەست بە سێبەری مەمكەكانت**
**من لەنێوان خۆم و تۆدا .. عاشقێكم بریندار بە سۆزی پەنچەكانت**

**دە راپێچم كه ، پەریزادە .. بەرەو جەهەنەمەكانی عەشقێك**
**من هەمیشه ئاوسم بە باران و نێرگز و ماچ**
**راپێچم كه ، بۆ سەیتەرەكانی بەهەشتێك.. بەماچ نەفەر ئاودیوكەنە باخەكانی خۆشەویستی**
**راپێچم كه، بۆ پێچەكانی هەوەستێك، كەقەت بەرد ناگرێتە هەتاو**
**بەرد ناگرێتە بەرد**

**ئەی تەجەلای نور .. هەر بە رووتی بێ ستیان و بێ رەنگ**
**بموەشێنە ناو تاریكایی خوێنت**
**پەرتم كه بەسەر پەلكەكانی رووبارێكی بێدەنگ**
**بمخۆوە ..وەك لیمۆی سەر مێزێك كه چاوەڕێی دەستێك ئەكات بۆ گوشین**
**چاوەڕێی لێوێك ئەكات بۆ مژین**

www.dengekan.com
12/8/2006

**من بێزارم لە بەهەشت و لەم کارانەی خوا ئەیکات**
**من بێزارم لە جەهەنەم و لەوکارانەی خوا نایکات**

**من خەتابارم لەو ماچانەی کە نایانکەم**
**من گوناهکارم لەوانی دیش.....**

**من لەنێوان ئاهەنگێك و ئاهەنگێکدا ئیمانێك ئەگۆڕم**

**لە نێوان ئیمانێك و ئیمانێکدا .. بێمانییەك هەروەك چاوە ڕەشەکانی تۆ**

**خۆشم ئەوێی بە سادەیی ..**
**کە بێ ستیان مەمکانت ئەخەیتە پەنچەم..**
**کە بێ ستیان مەمکەکانت ئەخەیتە دەمم**
**کە بێ ستیان مەمکەکانت ئەخەیتە چاوم**
**کە بێ ستیان مەمکەکانت ئەخەیتە روحم**
**کە بێ ستیان .. کە بێ ستیان..... چ گەمەیەك بەو مەمکانە و بە من ئەکەی...**

**لێت تورە نابم بەکورتی**
**خۆشەویستیت .زۆر جار بێ مانایە..**
**زۆر بێ مانا خۆشم ئەوێی**
**زۆر بێ مانا خۆشت ئەوێم..**
**زۆر بێ مانا یەکتریمان خۆش ئەوێ...**

www.dengekan.com
12/8/2006

**بیٚ ماناشه.. كه قه‌ت نه لیٚت توڕه ئه‌بم و نه به‌ردت تیٚئه‌گرم و نه‌گه‌مه**

**به‌مه‌مكه‌كانت ئه‌كه‌م كه بیٚ ستیانن.**

**شتی قوٚڕ له توٚدا هه‌یه**

**هه‌ندیٚ شتت هه‌یه هه‌رگیز له شتی عاشقه‌كان ناكات**

**هه‌ندیٚ شتت هه‌یه هه‌رگیز له شتی دزه‌كان ناكات**

**هه‌ندیٚ شتت هه‌یه هه‌رگیز له شتی بیٚكاره‌كان ناكات**

**هه‌ندیٚ شتت هه‌یه هه‌رگیز له‌هی قه‌حپه‌كان ناكات**

**كه‌چی ئه‌وه‌نده عاشقانه ماچم ئه‌كه‌یت و ئه‌وه‌نده دزانه ماچم ئه‌كه‌یت و**

**ئه‌وه‌نده بیٚكارانه ماچم ئه‌كه‌یت و ئه‌وه‌نده قه‌حپانه ماچم ئه‌كه‌یت.**

**له بیٚ مانایی من و توٚدا .. ژیانیٚك هه‌یه وه‌ك كه‌وسه‌ر**

**ئای ژیان له توٚدا چه‌ند خوٚشه!**

## مه‌زدای روح

2006/11/10

www.dengekan.com
12/8/2006

**له وێرانەی جوانییەکانمدا بەسەر پەرچەمەکانی تۆدا پێکەنینم ئەڕژا**
**ببورە ئەی خودا .. ببورە مەزدای ڕۆحی پەڕاگەندەی من**
**پێدەچوو لەو دەشتەدا شتێك نەمابێ لە سینەمدا**
**شتێك نەمابێ لە باخچەکانی هەبوون و فەنابوونمدا**

**ئەی تریفەی مەرقەدەکانی شعر و گوڵی مەرکانەکانی حەرفە تۆزاوییەکانم**
**زایۆنێکم گەرەکە .. بە ماچ بمکەیتە جەلاد**

**وەرە تێکەڵی ئەو جگەرەیە بە کە لەناو دڵمدا خوێنم ئەمژێ**
**وەرە بمکوژە ئەی عاتیفەی دڵبەر**
**وەرە و هەڵمگرە و بە مێلاقەکانی هزرتەوە وەك ڕێحان بمگوشە**

**لیمۆیانە بەسەر مەمکەکانتدا لێوم بکە بە باران و با تێکەڵ بین**
**با شەهوەت و عەقڵ و پەنجە و ڕۆحمان بکەینەوە بەناو یەکدا**
**وەرەوە من لەدەرەوەی تۆدا تۆفان ئەمبا**
**زریان ئەمکوژێ .. خوا ئەمدزێ**
**من لە دووری تۆدا .. مەسافەی پەنجەکانم و سوخمەمەکەت تادووری جەهەنەم**
**درێژ ئەبێتەوە**
**لەدەرەوەی تۆدا کراسێك یەخەی سەرخۆشە بە عارەقە و**
**دەماغێك بێهۆشە بێ بۆنی خۆشەویستی**

**ئەی خودای من بمدەرەوە .. هێزی ڤین و قودرەتی شەوبۆ**

**بمدەرەوە ئەی مەزدای ناز .. بمدەرەوە رۆشنایی و سەفای وەنەوشە**

**بە تولەرێی چی ئەگەمەوە دڵت ئەی نوێژی تاڤگە بۆ ئاوی ژیان**
**بە رەنگی چی ئەگەمەوە بەر سێبەرت ئەی فەنابوونم**

**بیمارانە بەسەر حەزمدا گۆرانی ئەڵێم و چاوانم لە روناکایی پەنچەکانتەوە ئەگەڕێن**
**من چیم داوە لەو سوحبەتە بێ ئامانە**
**لەو تەئەممولە بێ بەرائەتە**

**من لەرەگەوە هاوار ئەکەم .. لە زریانەکانەوە توندتر بەسەر ئەم ژیانەدا ئەڕشێمەوە**
**بێ مانا لە باخچەیەك نوێژ بۆ من مەکە**
**بێهوودە لە ئێوارانی سەرخۆشیدا بە دوای مندا مەگەڕێ**
**من ئەوەتام غەرقم لە ژیان و لە سەربوردەی پیاوە توڕەکان**

**من تەنیام و نامەکانی با ئەدەمە دەست پەلکی چنارێك تا بیداتە رووبارێکی شەیدا**
**شەیدا بە تۆ**
**شەیدا بە ئاوسبوونی تۆ لە پەلکە رێحاندا**

www.dengekan.com
12/8/2006

**من تەنیام و چاوەکانی هەتاو ئەدەمە دەست چرای بخورێك تا بیگەیەنێتە**
**مەعبەدێکی مەراق**
**مەراق بە یادگاری و وێنەکانی تۆ لە بەهەشتدا**

**من خۆم ئەدەمە دەست خوا .. تا بمداتە پێغەمبەرێکی دانا لە عەشق و سۆفی**
**لە مەحەبەت**
**خۆم ئەدەمە دەست یاخیبوون .. تا بگەمە شەڕەکانت**
**خۆم ئەدەمە دەست شێتبوون تا بگەمە حیکمەتەکانی ئازادی و**
**سنوورەکانی خۆشەویستیت**

**ئەی مەزدای من .. بە چی تێکەڵت بم ؟**
**بە کتێب و شەڕاب و شعر .. یان بە جگەرە و دڵ و هەناسەم**

**بەچی بێمە بەر چاوەکانت .. بە سوژدەی فریشتەیەکی رووت یان بە**
**شەڕەکانی عەشقێکی پڕ لە حیکمەت**
**چۆن پێت بلێم خۆشم ئەوێی ؟**
**خوێن بڕێژم یان گۆرانی ...**

**چۆن پێت بلێم بیکوژە .. ئەو دووڵییە بکوژە کە دووری ئەیچێنیٚ..**

12/8/2006

گویٚ له ترپەی دڵ و خشپەی پێم بگره
چاوده دەستنووسەکانی پیاوەتیم و ئازادیم له باوەشتدا

بڕوانه ئەو رۆحه .. لەدەرەوەی تۆدا چەند بەدبەخته

لێگەڕیٚ با بەدبەختی ئەم ولاٚته کەمێك بەسەر گوڵەسپییەکانی باخچەی ئەم شەوەدا خۆی نمایش کات

ئێمه لەوەرزێکداین خۆی داوەته دەست دزیکەرەکانی رەنگ
له بەهاری عەشقێکداین کەس پیاسەیەکی تێدا ناکات
له هاوینی حورمەتێکد داین کەس به پیرۆژی نازانێت
له زستانی فیراقێك داین کەس بۆی ناگرییێت
له پایزی مەرگێك داین کەس تەرمێك نابینیٚ

من و تۆ له چاو ژیاندا ئەوەنده گچکەین لەسەر پەلکی هیچ عەشقێکدا جێگه ناگرین
من و تۆ لەچاو ئازادیدا ئەوەنده بیٚ ئاسمانین لەسەر باڵی چ دەستورێکدا نافڕین
من و تۆ ئەوەنده تەڕین لەدەفتەری هیچ تەڵەبەیەکی ئیبتیدائیشدا حەرفێکمان لەسەر نانووسرێت
من و تۆ لەو بیٚ میهرییەدا ریٚ ناکەین نا..
من و تۆ لەو وشکایەتییەدا نابینه رەنگ

www.dengekan.com
12/8/2006

# خاك

2006/11/11









ئەبینم تۆ وەك پەپولەیەك بەسەر باڵەكانی مندا ئەسووتێیت و بەسەر روحمدا
وەك بۆنی بخور ئەڕژێیت
من ئێرەییم بە خۆم دا دێتەوە كە ئەبینم ئەوەندە جوان وەك سەماكەرێكی
رۆژهەلاّتی لەرەی مەمك و روحت ئەبارێنیتە سەر كتێبەكانم
ئێرەییم بە خۆمدا دێتەوە .. من بەرگەی ئەو هەموو جوانی و فڕینەی تۆ
ناگرم
من هەمیشە مەست بووم بە بۆنی كتێب و هزر و شعرەوە
كەچی ئێستا چاوت كانگای پەیڤە و روحت سەرچاوەی فڕینی من و بۆنت
سروشی ژیانە
تۆ ژیانی منی نەوەك كتێب و خوێندنەوە
تفی لێوەكانت چەند لە نووسین تەڕتر و ئاوی مەمكەكانت چەند لە شعر
خوناوتر

من لە تۆدا چەند لە خۆم خۆمترم
من لە ناو دەستەكانی تۆدا چەند ئاقلّ و حەكیمم
ئەی حیكمەتەكانی شوێنە موقەدەسەكان .. بە ئێوە شەڕێكم پێنەكرا وەك
شەڕی پیرۆزی تریفە
بە ئێوە كۆششێكم پێنەكرا وەك كۆششم بۆ چاوەكانی تریفە
ئەی تریفە بڕژێ بەسەرما وەك با تێكەڵم بە
من كتێبەكان توڕ هەڵئەدەم و خۆم ئەكەم بە نێو مەمكەكانتدا
شعرێكی ئەم گەردوونەم ناوێ كە ناوی تۆی تێدا نەبێت
من شەڕێكم ناوێت كەلەسەر ماچێكی تۆ نەبێت
من حیكمەتێكی ئەو ژیانەشم ناوێت كە نەمگەیەنێتەوە بە چاوەكانت

من لە ئێوارەكانی تۆدا ئەگەمە شەوەكانی ژن

www.dengekan.com
12/8/2006

**پیاسە لەگەڵ کۆتر و ستران و شعر و مۆسیقا بێ مانایە کە لە هەوارەکانی سینەی تۆدا نەبێت**
**تۆ بەهەشت نیت .. بەلاّم مەمکی هەموو حۆرییەکان لە سینگی تۆدا تام ئەدەن**
**تۆ ئازادی منی لە مەملەکەتی مێبووندا**
**تۆ هەواری منی لە خوێندنەوەی سێکس و چێژ و ژیاندا**
**من ئێرەییم بە خۆم دێتەوە کە بستێ زەویم نیە و لە جەستەی تۆدا خاوەنی هەموو جوانییەکانی خاکم**
**من ئێرەییم بە خۆمدا دێتەوە کە ژنێکم نیە لەم دونیایەدا و لە روحی تۆدا لەزەتی هەموو مێیەکان ئەچێژم**

**من خەیاڵم لە تۆدا**
**من تەمەنێکی ئەوەندە درێژم .. پێغەمبەرەکانیش ئێرەییم پێ ئەبەن**

**من ئێرەییم بە خۆم دێتەوە .. کە خوا لە سەحەردا هەواڵم ئەپرسێ و ئەڵێ نوێژم بۆ مەکە ، باسی جوانییەکانی دوێنێ شەومم بۆ بکە**
**ئەڵێم ئەی خودا باسی چیت بۆ بکەم؟ گەردونێك بوو دوێنێ شەومم تۆ لە هیچ قولاجێکییا دیار نەبوویت  دەعوەتت کەم**
**دەعوەتی بینینی جوانییەکانی تریفە و شۆخییەکانی من لە باوەشی رەنگ و شەڕی گوڵە ئەرخەوانەکان**
**تۆ لێرە نەبوویت ببینیت جەنگی ژنانە و پیاوانەی ماڵی من چۆن دار و بەرد و خەلیاقەتەکانی تۆی سەرخۆش کردبوو**
**تۆ لێرە نەبوویت ئەگەر نا تۆش کفرت ئەکرد و ئەهاتیتەوە سەر زەوی**
**لێگەڕێ با بۆت باس نەکەم ئەگەرنا تۆش ئێرەییت بە مندا دێتەوە**

www.dengekan.com
12/8/2006

ئەو ئەڵێ کوڕەکەم بۆم باس بکە ..
ئەی کوڕە چاو جوانەکەم باسی جوانییەکانی دوێنێ شەومم بۆ بکە

دوێنێ شەو بێ دەستی تۆ گوڵ لە چاوەکانم روابوون
پەنچەکانم ببوونە چرا .. سینگم ببووە رەزی ترێ و بۆنی شەڕاب لە هەناسەم ئەهات
پشتم ببوە باخی ماچ و گەردەنم هالأوی لەززەت
بنکەوشم ئەستێرەی لێ ئەرژاو خوناو لە کونیلەکانی لەشم ئەبارین
ماڵم ببوو بە گوڵزار و دوگردێك نەمابوو نوێژی لەسەر بکەم
پێویستیم نە بە تۆ و نە بە شیعر و نە کتێبان هەبوو
خۆم ببوومە تۆ و کتێب و شعر و گوڵ
ئەوەندە جوان و تەڕو ناسك ببووم وەك ئەوەی قەت ناوی تۆم نەبیستبێ
ئەوەندە خارا بووم هەرگیز هەستم بە ئێشی ئایەت و شەڕەکانەوە نەئەکرد
ئەوەندە ئێرەییم بە خۆمەوە ئەهات وەك ئەوەی لە کەڤڵی بنیادەمەکانەوە
چووبمە دەر و هیچ نەناسم
ئەوەندە سەرگەرم بووم .. شتەکان بە منەوە سەرخۆش ببوون
دوێنێ شەو کەس نەیپەرستوویت
دوێنێ شەو کەس ناوی نەهێناوی
دوێنێ شەو شەوی جوانییەکانی من بوو ئەی خودا

دوێنێ شەو من بووم ژن پیرۆزی ئەکردم و ئەیپەرستم
من بووم سەد جار بە قوربانم ئەبوو و ماچی ئەکردم
لەسەر سینەم نوێژی بۆ ئەکردم و ئەیکردم بە خودای تاکانەی خۆی
من بووم تامی بەهەشت و تاڤگەکانی جوانیم ئەدا
من بووم ئەرژامە ناو خوێنی ژن و هەڵمئەگرتن

www.dengekan.com
12/8/2006

هەڵمئەگرتن بۆ کەشکەلانێك کە تەنیا منی لێبوو
تەنیا منیان ئەدی و خۆیان بە قوربان و فیدا ئەکرد

ئەوان لە چاوی منەوە مەست ئەبوون و رووناکی دەستی منیان ئەخستە ناو مەکەکانیانەوە
ئەوان بە هەناسەی منەوە سەرخۆش ئەبوون و بۆنی منیان ئەخستە سینگیانەوە
ئەوان بە منەوە ئەیانزانی ژنن و پیاوەتی منیان ئەخستە روحیانەوە
دوێنیێ شەو ئێرەییم بە خۆمدا ئەهاتەوە کە پیاوەتی من لە تۆ گەورەتر و بە هەیبەتتر بوو

دوێنیێ شەو من لە تۆ گەورەتر بووم ئەی خودا.

دوێنیێ شەو پێویستم بە زمان و قسە و تەعبیر نەبوو
جەستەم رێبەری ژیانی ئەکرد
جەستەم نەخشەی شەڕەکانی ئەکێشا
جەستەم جوانییەکانی کۆئەکردەوە بۆ ئەوەی هێرش بەرنە سەر سەنگەرەکانی ژن
جەستەم ئەدوا لەگەڵ ئەو ژنانەی نە ئەوێران تەماشام کەن
نە ئەوێران چونکە ئەترسان زوو خۆ بەدەستەوە بدەن
ئەترسان خۆ بەدەستەوە بدەن و رسوا بن
ئەترسان منیش وەك تۆ دڵرەق بم
ئەترسان زۆر لە تام و لەزەتی جەستەم ئەترسان
کەیەکەم ژن لە یەکەم هێرشدا خۆی دا بەدەستەوە

www.dengekan.com
12/8/2006

**ئیدی هەموو ژنەکان پیرۆز بوون**
**هەموو ژنەکان بوونە یەك تاقەژنی رەنگاو رەنگ**
**هەموو ژنەکان ببوونە تریفە و لەناو هەلاڵەکانی جەستەی مندا نگوو ئەبوون**
**ئەڕژان وەك بارانێکی رەنگین و کوڵکە زێڕینە بەسەر مندا بزر ئەبوون**
**ئیدی من ببوومە خاکی پیرۆزی ژنەکان**

**ئیدی دوێنی شەو دەرسیٚ بوو پێی گووتم تۆ خاکی پیرۆزی ژنەکانی نەوك خوا!**

**منیش تێگەیشتم تریفە خاکی پیرۆزی لەززەت و چێژی منە نەوەك شعر و کتێب**
**نەوەك قسە و تەعبیر**
**نەوەك گۆرانی و مۆسیقا و رووناکی**
**تورە مەبە ئەی خودای من کە لەو سەحەرەدا جوانی لە هەناسەمەوە ئەڕژێت و ئە قسانەت بۆ ئەکەم**
**تورە مەبە خوا جوانەکەی دوور لە من و ماڵەکەی من لە دوێنیٚ شەودا**
**تورە مەبە من هەر ئەوەندەم کە خاکی پیرۆزی ژنەکان بم و خۆشم لە تامی تریفە ئەگەڕێم**
**هەر ئەوەندەم ، روحم لە مشتی مندا نیە و هەوا و هەوەسی خۆشم لە شوێنیٚ شك نابەم**
**من هەر ئەوەندەم هەیە بۆ وتن ئەی خودای من !**

www.dengekan.com
12/8/2006

# ڕێحانێك هەناسە

# ئەچێنێ

# پیربوونێك دائەگیرسێ



www.dengekan.com
12/8/2006

# ڕێحانێك هەناسە ئەچێنیٚ ....
# پیربوونێك دائەگیرسیٚ



**پێشکەشە بە تریفەی دۆسکی**
**بۆ ئەو فرمێسکانەی لە شەوانی نووسین و**
**خوێندنەوەدا ئەکەوتنە سەر گۆنات.**

www.dengekan.com
12/8/2006

ئەو مرۆڤانە بەرەو کوێم ئەبەن
من کە هێشتانەکە فریانەکەوتبووم لەبەر ئاوێنەکانەوە بە رووتی تەماشای خۆم کەم
کە هێشتانەکە پێڕانەگەیشتبووم تێر لەزەت لەو قسانەوە بکەم کە ئەیانگووت کچێ ..جوان بوویت ..جوان..،
من کە هێشتانەکە.. ئەو خەونەم بۆ تەواو نەئەکرا کە کوڕێك ماچم ئەکات..
من کە تازە .. خەریك بوو باڵم ئەگرت .. فێرە فڕین ئەبووم
تازە چاوەکانم ئەبڕینە ئاسمان و خۆزگەم ئەخواست.. دەسگیرانێکم بێت..،
من تازە هەستم ئەکرد ئیدی کوڕان وەك ژن تەماشای جەستەم ئەکەن..،
من ئەمزانی ماڵی مناڵی جێئەهێڵم و .. باوەش بە ئازادییەکەوە ئەکەم..
غرورێك ئامێزم بۆ ئەکاتەوە..،
تازە ..کلم ئەڕشت و.. خەریك بوو داوم ئەهێنا بە برۆکانما..
پرچم ئەکەوتە سەر شانە رووتەکانم و .. خۆم بۆ خەیاڵ ئەکردەوە.. وەك ئەو پیاوەی هەموو روومەتی بۆ ردێن ئەکاتەوە..،
ئەمانە سەرەتایەك بوون، لەمنەوە هەڵئەڕژان،
سەرەتایەك دوای دەرچوونم لە ژوورەکان و پێنانە باخەکانەوە..
دوای ئەوەی فێربووم خۆم بۆ خەونەکانم شلکەم..،
شل شل.. هەندەی پەلکی لاولاوەیەك..،
دوای ئەوەی فێربووم.. چاوەکانم بکەم بە چۆلەکەو هەموو قوژبنەکانی ئازادی بگەڕێن..،

دوای ئەوەی خودام دی لە تەنهاییدا ئەخنکیٚ و پیٚغەمبەرەکان.. داوای ژیانەوە ئەکەن..، مەلیك تاووس پیٚئەکەنیٚ و .. منیش مەراقەکانم ئەکەمەوە..،
دوای سەفەریٚك..، کە پیٚی گووتم..، تۆ گەورە ئەبیت..، ئیٚرە بە ویٚنەیەکی دی ئەبینیت..، ئیٚستا بە رەنگیٚکی دیکەوە تەماشا ئەکەیت..،
من .. مەراقەکانم ئەکردنەوە و.. ئەمگووت با گەورە بم..
لەگەل رەنگ و لەگەل دەنگ و خەونەکانم با گەورەبم..
با لەو بەیارانە گەورەبم.. کە خۆشن بۆ گەشانەوە..
با لەو ریٚیانە گەورەبم.. کە جوانن بۆ گەیشتن بە ژیان..
با لەو شانۆیە گەورەبم.. کە سەرسامییە بۆ حەقیقەت..
با گەورەبم.. وەکو باران بە رووتی
وەکو هەور بە ئاوسی
وەکو هەتاو بە گەشی
وەکو شعر بە خویٚنگەرمی
وەکو دەریا پایەدار..

لە دواییشدا.. وەك کچیٚکی چاو خومار و .. مەزەدارو .. نازدار..
نازدار وەك گوڵنازو نازەنین..،
با گەورەبم .. لەگەل ئەو خەونانەی تازە دیٚنە ناو نوینەکانم
با گەورە بم و شەوەکان سپیتر ببینم..،
گەورەبم و زیندەخەوەکان گوناه ببینم..
گەورە بم و .. جەستەکان رووتتر تەماشاکەم..
گەورە بم .. وەك با و.. باروڤە خۆم بۆ ژیان بەرِەڵلاکەم..
گەورەبم و پیٚتان بلٚیٚم..

**هەموو ماچێك گوناه نیە و هەموو ماچێك لەزەت نیە..**

**هەموو رووتبوونەوەیەك ئازادی نیە و.. هەموو رووتبوونەوەیەك خەتا نیە..**

**هەموو شەڕێك پیرۆز نیە و .. هەموو شەڕێك ئاژاوە نیە..**

**هەموو ژیانێك حەقیقەت نیە و .. هەموو ژیانێك وەهم نیە..**

**با گەورەبم و..، خەونەكانم وەكو ئاو جەستەی رووتم تەڕكەن..**

**من خەریك بوو گەورە ئەبووم..، ئەمەیان سەرەتای چیرۆكی ترسی من بوو..**

**گەورەبوونم.. پیاوەكانی ماڵەكەمی ترساند..،**

**گەورەبوونم.. وایكرد پیاوەكانی ماڵەكەم دەستم بگرن و بمبەن..،**

**بۆ كوێم ئەبەن ..؟ نزانم..،**

**لێ دڵنیام.. ئەو رێیانەی پیایدا رەت ئەبین.. ئەوانە نین بچنەوە سەر ئەو رەزانەی خۆشن بۆ رۆشنایی..،**

**ئەو باخانەی پیایدا ئەبوورین ئەوانە نین.. خوێنت گەرمكەن بۆ فڕین..،**

**ئەو رۆژگارانەی ئەوان باسی ئەكەن.. ئەوانە نین شەوی سپی تیا بژیێ..،**

**ئەو ئاسمانەی ئەوان ناوی ئەهێنن، ئەو ئاواییە نیە، خەیاڵی تێدا داگیرسێ..،**

**لێرەدا.. خەونەكانی من حەرامن**

**هەموو رووتبوونەوەیەكم.. خوێنڕشتنم حەلاڵ ئەكات..**

**هەر باوەشكردنێكم بە پیاوێكدا.. هەر ماچێكم لە روومەتی هەر كوڕێكدا خەتایەكە ..، بەقەد .. دەریا پڕ و تژی..**

**لێرەدا هەر گەورە بوونێكم.. گەورەبوونی خەون و روانینەكانم..، ترسێكە ..گەورەتر لە سكپڕبوونی كچێتی..،**

**لێرەدا .. كە تازە گەورە ئەبووم..، ترسیش لەگەلم گەورە ئەبوو.. لە من زووتر .. خێراتر.. مەزن ئەبوو..،**

**بە شێوەیەك تا لە جوانیدا چاوم گوڵێكی دەرئەكرد.. دڵم باخێك ترسی ئەدووریپەوە..!**

تا پەنجەکانم لاسکی نیسانۆکێکیان ئەکردە گوستیلە.. دەستەکانم پڕ ئەبوون لە کەلەپچە..،

تا تێر بۆنی ڕێحانێکم ئەکرد..، هەستەکانم بە زنجیر گرێئەدران..،

لەگەل مندا .. خۆم و ترس گەورە ئەبووین..،

ئەگەر سەرنجی خۆشەویستییەك لە دیدەما سەریهەڵئەدا..، ئەوا زیندانێك لە دەروونما بۆ تەماشاکانم ئاوا ئەبوو..

ئیدی گەورەبوونم..، لە چێژی منەوە.. بووە ترسی پیاوەکان

لە خەونی منەوە .. بووە گەمەی پیاوەکان

لە ئومێدی منەوە .. بووە زیندانی پیاوەکان

ئەو پیاوانەی هەرگیز نەیانئەزانی گەورە ئەبم

ئەو پیاوانەی هەرگیز نەیانئەویست گەورەببم

ئەو پیاوانەی هەرگیز حسابی ئەوەیان نەکردبوو بە گەورەیی بمبینن..

ئەوان دایاننابوو.. بەر لە گەورەبوونم ئەوان بمرن..

بمرن و بە گەورەییم رانەگەن..

بمرن و نەبینن.. سینگم وردە وردە گەورە ئەبێ و گوڵی مەمکم وەك گوڵهەنار لە سینەمدا چرۆ ئەکا..،

بمرن و نەبینن.. ئارەزووی ماچ و هەوەس.. وەك عارەقە لە جەستەمدا سەرکا..

بمرن و نەبینن.. خۆشەویستی لە چاوانم وەکو باران ئەڕژێ..

بمرن و نەبینن.. پەلکی ڕێحانەکان بکەمە لێوی کوڕان و بیانمژم و گەلاٌمێکوکێك بکەمە پەنچەی پیاوان و بیانخەمە ناو سینگمەوە..

بمرن و نەبینن.. خەونەکانم لە هەناسەم گەرمترن..کاتێك کوڕان ماچم ئەکەن..خۆشیانئەوێم و لەناو خۆیان فەنام ئەکەن..،

من گەورەبووم.. گەورەبووم و نەمئەزانی.. لێرەدا گەورەبوون ئاوا زوو ئەبێتە ترس .. ئاوا بلەز .. ئەبێتە تەنهایی !

ئاوا خێرا.. تخووبەکانی ژیان ئەبەزێنیٚ و لەسەر عەردەکانی مەرگ ئەوەستیٚ..،

گەورەبووم .. بیٚ ویستی پیاوەکان..،

ئەو پیاوانەی کە وابزانم دایاننابوو..، من بمرم و گەورەنەبم

بەر لەوەی گەورە ببم ئەبیٚ بمرم .. یان لە تەنیاییدا بخنکێم..،

چونکە دایکم ئەیگووت کچەکەم تۆ لە منداڵی زۆر تەنهابوویت..،

هەندە تەنیا.. کە پێمان وابوو.. تۆ قەت گەورە نابیت..

هەرگیز .. لەو تەنیاییەدا.. خەیاڵناکەیت.. چرۆ ناکەیت، گوڵناگریت..،

بەڵام.. من گەورەبووم .. لەو تەنهاییەدا خەریك بوو دەرباز ئەبووم..

ژیان ئەهاتە خەیاڵمەوە..، ئەڕژایە خوێنمەوە..

من خەریك بووم.. هەردوو دەستم.. هەندەی دونیا بۆ ئازادی و ژیان ئەکردنەوە..،

شۆڕشم لەسەر حەرف و حەزەکانی خۆ ئەکرد

من خەریکی ژیان بووم..، بە قوڵیی ئەندێشەکانم روو ئەچوومە ژیان..،

بە چێژی خۆشترین دەمار.. دەستم لە ژیان ئەدا..

بەدەر لە ترسی گەورەکان..، بەدەر لە خەونی پیاوەکان.. دوور لە دونیا و دینی پیاوەکان..، بۆ چەند ساتێك..، گەورە ئەبووم..

گەورە ئەبووم.. و ئەمگووت ئەی باران وەرە با تەڕتکەم..

ئەی شەو .. وەرە با رەوشەنیت پێببەخشم..

ئەی باڵندە.. وەرە ئاوازانت دەمیٚ..

ئەی بەهار.. وەرە با سەوزتکەم..

وەرە ئەی عەشق.. با ماچ بخەمە قامووستەوە..

من گەورە ئەبووم و.. ئەمویست هارانە عەشق بکەم و

عاشقانە خەیاڵکەم و..

خەیاڵیانە ژیانکەم..

من گەورە بووم و ئەمویست هەموو شتێك لەگەل خۆمدا گەورە بکەم..
خەونەکانم.. گوڵەکانم.. حەقیقەت و ئازادی و پەیڤەکانم..
ئەبوایە من.. گەورەببام و جوانترین کچ بام..
ئەبوایە من گەورە ببام و .. شۆخترین ئازادی بام..

ئەبوایە من گەورە ببام و ..وەك هەتاو.. وەکو باران .. حەقیقەتیشم گەورە ببا..،
دەنگیشم گەورە ببا و وشەشم پڕشنگدار..،
لێ گەورە بووم و .. و پیاوەکانی ماڵەکەم .. دەستیانگرتم..
ئەو دەستانەی .. تازە خەریکبوون.. لەدوای پەنچەی کوڕێك ئەگەڕان
پرچیان راکێشام.. کە تازە خەریکبووم .. فێری خەنەی بکەم..
چاوەکانیان گرێدام .. کە خەریکبوو رابێم بە کلدانییان..
پیاوەکان..، رازینەبوون بە گەورەییم..، قایلنەبوون بە ئازادیم..،

ئەو پیاوانەی ماڵی ئێمە زۆر سەیرن..،

من سەرەتا وامزانی ئەو پیاوانەن .. وەك بە منداڵی رەنگییان نەدیوە..
ئێستاش کە ماڵمان پڕە لە گوڵ ..، ئەوانە سەری گوڵەکان ئەبڕن و خەونەکانی خۆیانی پێ رەنگ ئەکەن..،
گوتم ئەو پیاوانە، بە منداڵی خەیاڵییان نەکردۆتەوە..، ئێستاش کە ماڵمان تژیە لە عەشق ..، ئەوان عەشقەکان کوێر ئەکەنەوە و خەیاڵەکانی خۆیانی پێ ئەڕازێننەوە..،
گوتم ئەو پیاوانە، بە منداڵی ، مەراقەکانیان نەزۆك بوون، ئێستاش کە ماڵمان ئاوسە بە جوانی، ئەوان جوانیەکان لەبار ئەبەن و مەراقەکانیان ئەکەنە باران..،

گوتم ئەو پیاوانە، زوو..، نەگەشاونەتەوە، ئێستاش کە ماڵمان پڕە لە هەتاو
ئەوان گزنگەکان ئەبڕنەوە و سۆماکانیان ئەکەنە چراخان..،
گوتم ئەو پیاوانە سەرەتا، ئاویان نەدیوە، ئێستاش کە ماڵمان پڕە لە باران..،
ئەوان ، دڵۆپەکان ئەگرن و خۆیان ئەکەنە رووبار..،
ئەو پیاوانە سەیرن، فێرنابن بە گەورەیی من رازی بن؟
فێرنابن.. جوانی لە سەماکردنما ببینن..،
فێرنابن.. عەشق لە رۆحما بدوێنن
سەیرن پیاوەکانی ماڵی من، دەستم ئەگرن و خۆشیان نازانن بۆ کوێم ئەبەن
بۆ خەرەندی چ مەرگێك و .. دەربەندی چ خنکانێك..؟
پیاوێك .. رقی لە بۆنی رێحان و خەنەیە لەسەر پرچم..
پیاوێك بە کلی چاوەکانم تورە ئەبێت..
پیاوێك بە گۆرانییەکانم سەری دێشێت..
پیاوێك گاڵتەی بە شعرەکانم دێت..،
پیاوێك دەستم ئەگرێ و پێم ئەڵێ.. من نایەڵم تۆ تەڕ بیت..
پیاوێك ئەڵێت من نایەڵم هەتاو لێتدات ..
پیاوێك ئەڵێت من لە جیاتی تۆ خەون ئەبینم.....
پیاوێك ئەڵێت من ئەزانم تۆ چ بەلآیت ..، گەورە بوونت چ فتنەیەکە..
من ئەزانم تۆ چ تەمایت..، ئازادبوونت چ خەونێکە..،
لێمەگەڕێن..، ئەم کچە جوانە گەورەبێت..، ئەگەرنا ماڵەکانمان وێران ئەکات
لێمەگەڕێن..، ئازاد بێت ..، ئەگەر نا باخەکانمان ئەکاتەوە ئەشکەوت..،
لێمەگەڕێن، حەقیقەتێك لە ناوچەوانییەوە بزێت و لە دونیای غەیب
دەرممانکات..،
لێمەگەڕێن، بایەك لەناو پرچییەوە هەڵکات..
بزەیەك لە چاوانییەوە هەڵفرێت..،

www.dengekan.com
12/8/2006

که کچه گچکەکان گەورە بن..، پیاوەکان پیر ئەبن..،

من گەورە ئەبووم و.. پیاوەکانی ماڵی منیش خاڵی ئەبوونەوە..،
خەیاڵیان لە کورتی ئەدا، موعجیزەی دیکەیان پێ نمایش نەئەکرا..،
من گەورە ئەبووم و .. ئەوانیش گچکە ئەبوونەوە ..،
من گەروە ئەبووم و .. ئەوان ئازادییان ئەدۆڕاند..،
من گەورە ئەبووم و .. ئەوان جوانیان بزر ئەکرد..
من گەورە ئەبووم و .. ئەوان تەنها ئەبوون..،
من گەورە ئەبووم و.. ئەوان بێزار ئەبوون و دواجار تەحەمولی گەورەیی منیان نەما..،
بەرگەی ئازادی و جوانی منیان نەگرت..،
بێزار بوون لەو تەنهاییەی ئەیپێچانەوە..،
من تەنهایی مناڵی خۆم پەرش ئەکردو .. جحێڵ ئەبووم
ئەوان تەنهاتر ئەبوون و .. پیر ئەبوون..،
بەرگەی ئەو شۆڕشە جوانەیان نەگرت.. کە منیان جوان ئەکردو ئەوانی پیر ئەکرد..،

سەیربوون ئەو پیاوانە..،
پیربوونی خۆیان و جوانبوونی منیان خستە سەبەتەیەکەوە..،
تەنهایی خۆیان و ئازادی منیان خستە میزانێکەوە..،
منیان کردە..، سەرکانی سەرگەردانی  روحی ئەوان..،
گوتیان ئەوە زریانە و بارانەکانی ئێمە ئەشێوێنێ ، با تێکەڵی هەورەکانی ئێمە نەبێت ئەو کچە نەگریسە..
پیاوە سەیرەکان، لێم تورەبوون..،
تورەبوونێك کە چەندی بڵێی بێ رەحمی ئەکردن

**هەندەی لە دەستییان ئەهات دڵڕەق ئەبوون..**

**دوایی هەندە دڵتەنگ بوون، کە بەرگەی پەڕی گوڵێکیان نەئەگرت،**

**تەحەممولی هەناسەی درەختێکیان نەئەگرت**

**بە هەموو شتێك هەڵئەچوون..، بەهەموو شتێك دۆودۆشاوییان تێکەڵ ئەکرد..**

**پیاوەکان، دەسەڵاتی خۆیان تێکەڵ بە خەونەکانی من کرد..**

**مەرگەکانی خۆیان خستە ناو ئازادی منەوە..**

**تخوبیان لە نێوان دونیای من و خۆیاندا نەهێشت..،**

**ئەیانەویست، دیسانەوە بێنەوە ناوم و داگیرم کەنەوە..،**

**بمکەنەوە بەو کچە تەنیایەی، مەراقەکانی ئەخاتە دڵییەوە..،**

**بمبەنەوە ماڵەکانی مردن و .. مەسافەکانی بندەستیم بۆ درێژتر کەنەوە..**

**ویستیان، بە گەڕانەوەیان بۆ سەر خاکەکانی من، نەخشەی وجودی خۆیان ببیننەوە کە خەریك بوو بزریان ئەکرد..،**

**ویستیان ئاڵاکانی رۆحیان لەبەر دەرگاکانی مندا بچەقێننەوە کە کاڵ ببوونەوە**

**ئەیانزانی گەر رۆشنایی ئازادی بەر ژوورە تاریکەکانی ئەوان بکەوێ..،**

**ئەوان چەند تەنها ئەمێننەوە..،**

**بۆیە پەنجەرە قەپاتکردن بە تەنیا بەس نەبوو..**

**ئەبوایە.. دەستم بگرن، رێم لێبگرن..، رۆشناییم بکوژێننەوە..**

*** * * * * ***

**پیاوەکانی ماڵەکەم.. کە بەشێکیان برام بوون و بەشێکیشیان باوکم بوون و بەشێکیشیان خۆشەویستەکانم بوون..،**

**سەرەتا .. پێش پایزە تووش و وەرزەکانی دڵداری و بەهارە خوێناوییەکان و ساتەکانی سەرمەستیدا ئەمناسینەوە..**

پێش زستانەکانی بارین و فڕینەکانی هاوین لە زەمەندا .. لێکم جیا ئەکردنەوە..

وەك چۆن وەنەوشە و پێکەنینی کۆترەکانم جیائەکردەوە..،

سەربوردەی پیاوەکان.. براکان و باوکەکان و خۆشەویستانم ..

چیرۆکی گەورەیان لە پشت نەبوو..، هەندێجار ئەکرا لەرستەیەکدا کورتیان کەمەوە.. بە وشەیەك پێناسەیان بکەم..،

بە لاسکی مێکوکێك بیانبەستمەوە..

هەندێجار هەستم ئەکرد..

باوکەکانم .. کە هەر لە زووەوە توڕە بوون .. لە من بچووکترن

براکانم.. کە هەر لە زووەوە شەڕۆك بوون .. لە من ئاوسترن

خۆشەویستەکانم کە هەر لە زووەوە شەرمن بوون.. لە من بەنازترن..

ئەوان بە توڕەیی و بچووکی و شەڕۆکی و ئاوسی و شەرمنی و بەنازییەوە زۆر جوان بوون..

جوانتر لە خەونەکانی من لە راپەڕیندا..

بەریئانە لەگەل یەك باسی منیان ئەکرد..، هەروەك ئەوەی باسی باخچەیەکی پڕ هەنجیر ئەکەن..،

بەهێمنی باسی جلەکانی منیان ئەکرد..، هەروەك ئەوەی باسی دنکەکانی هەنارێك ئەکەن..،

ئەوان ئەوسا پیاوەکانی ماڵێك بوون.. لەناو ئاگردا سەمای ئەکرد

لە ناو خوێنێکی تاریکدا.. بۆ رووناکی ئەگەوزان و پێئەکەنین..،

ئەکوژران و پێئەکەنین..، هەروەك ئەو ساتانەی لەگەل منالّی مندا پێئەکەنین..

ئەنفال ئەکران و پێئەکەنین..، هەروەك ئەو کاتانەی بۆ یەکەمجار منیان بردە مەکتەب

www.dengekan.com
12/8/2006

**کیمیا باران ئەکران و پێئەکەنین، هەروەك ئەو دەمانەی بەیەکەم دەرئەچووم..**
**ئێمە هەر هەمووومان..، پێئەکەنین..، بێ باخچە بووین .. بێ ڕێگە بووین..**
**نەحەوزێکمان بۆ خۆ هەبوو.. نەحەوزێکیش بۆ تریفە..، کە چی دڵمان چراخان بوو..**
**هەموو ڕۆژێك .. زیاد لە جارێك لە دار ئەدراین.. کەچی هێشتا پێکەنین لە دڵمانا فوارەی ئەکرد..،**
**ئای کە خۆشبوو.. تریقەی پیاوەکان کاتێك زۆر ئەترسان..**
**ئای کە خۆشبوو.. دڵکرانەوەی پیاوەکان کاتێ کە ئەگریان..**
**ئای کە خۆشبوو.. کە کەس نەیئەتوانی زەفەر بە خەونی پیاوەکانی ماڵەکەم ببات..،**

**خۆشبوو هەموومان ئەمانزانی گوڵێك.. هەمیشە لە مەفرەقێکەوە چاوەڕێمان ئەکات**
**خۆشبوو دڵنیابووین هەمیشە هەتاوێك لە باخچەیەکەوە نۆبەتمان بۆ ئەگرێت ..**
**دیسانیش خۆشبوو کە بە ئەکیدی ئەمانزانی لە پیاسەکانی ئازادیدا هەمیشە بە سەر کەمینێکەوە ئەکەوین و ڕەنگە ئاوزینگ و گەوز بدەینە ناو زنجیرەکان..**
**لەوێوە ڕۆژانێك بوون کە هەمیشە بە شیعر لە ماڵ نزیك ئەبووینەوە..**
**لەوێوە بە شیعر لە خوا نزیك ئەبووینەوە..**
**خۆشبوون ئەو ڕۆژانە کە من و پیاوەکانم هەمیشە لە یەکدی نزیك ئەبووینەوە ..**
**ئەوەندە نزیك .. وەك ئەوەی لە هالآوی عەشقدا ئاوێتە بین..**
**ئا ئەو کاتانەش لە ناو مەرگ و زنجیردا.. کەس هەندەی من و پیاوەکانم لە ئازادی و لە خەوندا .. نزیك نەبوو**

www.dengekan.com
12/8/2006

******

**که یەکەم پیاو لە ماڵەکەمدا دوور کەوتەوە**

**لەیەکەم نامەیدا بۆی نووسیبووم یادت ئەکەم**

**لە دووەم نامەیدا بۆی نووسیبووم .. غوربەتیش وەك خۆشەویستی تۆ کوشندەیە**

**دووریش وەك باوەشی تۆ عەزابە.**

**لە سێیەم نامەدا بۆی نووسیبووم ئەمە دوا نامەمە خاتوونەکەم**

**تۆ و هەر پیرەژنێکی ولاٌتەکەم لە ژیان و مردندا یەکسانن**

**تێم بگەیت یان نەگەیت .. کە ئەمری تەنها ئەمریت**

**وەك هەر پیرەژنێکی دیکە ..**

**کە ئەتەوێت گەورە بیت .. ریسوا و زەلیلی .. وەك هەر پیرەژنێکی دیکەی تەنها و بێکەس..**

**ئیدی ئەمە دوا نامەی بوو کە پێم وابوو خاڵییە لە حیکمەت و پڕە لە ترسێکی چاوەڕوان نەکراو**

**من خەیاڵم زیاتر لەسەر سۆزی ئەو پیاوانە بوو کە لە گڕکان ئەچوون و لەسەر دەستی مندا وەك ئەستێرە و مۆم ئەکوژانەوە**

**من زیاتر چەترم بۆ ئەو پیاوانە هەڵدابوو کە لەبەر هەیوانەکانی جوانی مندا خەریکی گەمەیەك بوون کە من تا ئەو ساتەی پێش ئەوەی دەستم بگرن و بمبەن وامئەزانی ئەوان کوڕە قۆزە عاشقەکانی پەرچەمی من و ئازادی بەژن و جوانییەکانی سینگی من و خرپنی ناو لەپەکانی منن**

www.dengekan.com
12/8/2006

من واتێگەیشتبووم ئەوان ئەو برایانەن کە هەر ڕۆژەی یەکێك وەك با
هەڵمئەگرێت و یەکێك نێرگزم بۆ ئەکا بە قایشی کەمەر و یەکێك ڕێحان
ئەخاتە هەناسەم
من زۆر شتی دیکەم لە کەللەی پوتما بوو
هێشتا دەیان چیرۆکی وەفا و هەقایەتی ئازایەتی و ئەفسانەی مەردایەتی
پیاوەکانم لە هەگبەدا بوو کە ئەوان کردیان بەشەڕ و هەرا
کە ئەوان کردیان بە وەرزی بڕینەوەی خەون و هومێدەکانی کچێنی من و
ئەرخەوانی سەر گۆی مەمکەکانم
گووتم لێمگەڕێن شەڕێك مەکەن بە هەنیەم و رووبارێکی هەناسەم کوێر
مەکەنەوە
من هیچم ناوێت ، نە بۆنی مێخەك لە مەمکما بێت نە ڕەنگی گێلاس لە
لێوەکانم
من ئامادەم بەیارەکانی پرچم وەك شەوە ڕەشەکانی ناو سۆمای تورەی ئێوە
ڕەش کەم و ڕووناکی لە ژوورەکەمدا دەرکەم
گووتم من ئەو نامانانەی پیاوەکەی ئاوارە بوو ئەسوتێنم و ئێوەش بەسکەن
لە خوێندنەوەی حیکمەتەکانی ئەو نامەیە کە پڕە لە بۆنی دووری و ترس و
کوشتن و شەڕ
بەسکەن من گەورە ئەبم .. با لەو حەلەدا گەورەییم بوەستێت و ئێوەش
بمبڕنەوە لە کوێوە حەز کەن گچکەم کەنەوە
گووتم پیاوەکانی ناو دارستانەکانی ناشیرینییەکانی من و زەقنەبووتەکانم
من بۆ ئەبێت تاهەم بە ئازاری ئازادی و ئازاری گەورە بوونی گۆی مەمکەکانم
بتلێمەوە..؟
کە ئەتلێمەوش بۆ ئەبێت ئاوا ڕەش ڕەش بسووتێم و وەك ئەنفالێکی زەمانی
ڕەش و هیواکان

www.dengekan.com
12/8/2006

ئەمجارەشیان لە زەمەنی عەشقێکی دیکەدا ئەنفال بکرێم و رەش رەش
بچمەوە ناو عەشقێك و لەوێدا جارێکی دی بخنکێم
بخنکێم و لە شیلاوی خۆشەویستییەکی مزردا وەنەوز بدەم و کەس باوەڕ
نەکات ئەوە منم ل

عەشقی خۆم و پیاوەکان و کوڕەکان و مێردەکان و برایەکاندا ئەکوژرێم و
لەت و پەت ئەکرێم و وەك لاسکی هەر مێوێکی بیٚ بەر بە دەستی
باخەوانەکانی ماڵەکەی خۆم.. خۆم و گوڵە رێحانەکەی ناو ئینجانەکەی
ژوورەکەمدا ئەکوژرێم و ئەمرنەوە...
بمرنەوە کە ئێستا زەمەنێکە بۆ شین بوون
بمکوژێننەوە کە ئێستا گاڤێکە بۆ رۆشنایی
بمکوژن کە زەمەنی گەورەبوونی منە ئەی پیاوە پیرەکانی ماڵەکەم
ئەی پیاوە پیرەکانی ئەو شەقامە هەرزانەی کە ئیدی نازانن پیایدا بڕۆن و بیٚ
شەڕ پیاسەیەکی تیادا بکەن
ئیدی ئێوە پیر بوون و ناتوانن لە شەوەکانی هەیوانی مندا بیٚ کەمین نانەوە
و خەفەریات و حەرەسگرتن بنوون
ئیدی ناتوانن لە باخچەکانی مندا بیٚ سەنگەر دانان و سەنگەر گرتندا
مەسینەیەك ئاو بڕێژن...
ئای لە گەورە بوونی من و گچکە بوونەوەی ئێوە

برایەك لە ئیجەوە بۆی نووسیم: لێرەدا دەستم ناگا بەتۆ ئەی قەحپە
تۆش بۆنی پرچت ناگا بەمن .. کەواتە من چەند بەختەورەم..؟

ئەڕۆیشتن و لەوێوە حیکمەتنامەی رەشیان ئەنووسییەوە ، وایانئەزانی من
تەواوی نەگبەتییەکانم لە مستە

**ئەوانەی تاقەتییان نەمابوو تەماشام کەن .. ئەوانەی بێزار بوون لە بۆن و ئارەقە و شیلەی گەردەنم**
**ئەڕۆیشتن و جۆرەها نامەی رەش و قسەی رەشیان بۆ ئەنووسیم**
**برایەکی بچکۆڵە گووتی ئەزانم ئەتکوژن .. هەر ئەتکوژن .. من نە دەرەقەتی ژیانی تۆ و نەدەرەقەتی مەرگی تۆ دێم**
**تۆ .. نە ئەمەوێ خەفەتت بۆ بخۆم و نە شادیت پێوە ببینم .. تۆ تەواو لە کراسێك**
**ئەکەیت پینەی تێ بووبێت.. ئیدی بەکەڵکی منەوە نایێیت..**
**برایەکی دی لە پشت دەریاکانەوە ئەیگووت.. با بتکوژن کە تۆ هەزارەها پەت و سێدارەت لە پەرچەمەکاندا بە ئاگا هاتوون**
**تۆ نیشتمان نیت لەویش کمباختر و تووڕەهاتتریت**
**تۆ بەهەشت نیت لەویش بێ ئومێدتر و موفلیستریت**

**یەکێکی دی بە برینداریییەوە بە خوێنی خۆی بۆی نووسیبووم .. قەحپە من لەهەر شەڕێك کوژرابم ئەوە تۆ سەبەبیت**
**لەشەڕی نیشتمان یان بەهەشت یان هەر شەڕێکی تر کە تۆ لەوێدا حازریت..**

**ئیدی من ئەبوومە بەهەشت و خەڵکم بە کوشت ئەدا ئەبوومە نیشتمان و خەڵکم فەوت ئەکرد..**
**وامزانی گەورەبوونم بەلأیە .. نەوەك عەشق**
**گەورەبوونم مردنە نەوەك ژیان ..**
**من بۆ ژیان گەورە نەئەبووم .. من بۆ نیشتمان خاکەکانم ئازاد نەئەبووون ..**
**من بۆ ئازادی درێژ نەئەبووم**

www.dengekan.com
12/8/2006

ئیدی ژیانم بووه كابوس و خۆزگەم خواست هەر ئەو كچە منداڵە بوومایە لە حەپسێكی بەعسییەكانا تا ئەهات رووت ئەكرایەوە و ئیغتیساب ئەكرا و پێئەكەنی

هەر ئەو كچە بوومایە براكانم بكوژرابان و لە حەوزی زرنیخ و تیزابدا ماچییان بە نامە نووشتاوەكانییان بۆ ناردبام و منیش لەگەڵ دایكما هەمیشە و هەمیشە بگریابام و تێر تێریش لە خەمی باوكەكانی نوگرە سەلمان و براكانی شاخ و حەرفی نامەكانی نیشتمان و ئایەتەكانی بەهەشتێكی وێران و كاولبوودا هەمیشە دڵم كول و جەرگم كول و بیٚ بووكە شووشە و قردێڵە و قەنەفر بام...

ئەبوایە من هەمیشە خۆزگە خوازی رۆژانێك بم كە تیایدا سەد جار ئەكوژرام و نەئەمردم

هەزار جار ئیغتیساب ئەكرام و لە كچێیتی نەئەكەوتم

یەك ملیۆن جار ئەسووتام و رەش هەڵنەئەگەڕام و

ملیار جاریش ئەنفالئەكرام و ئازادیم زەوت نەئەكرا....

ئێستاش حەرفی برایەكی تورە .. تفی باوكێكی شەڕ كەر .. دوای ئەنفال و دوای قانوون و رەنگەكانی مردن ئەتوانن تاكە زنجیرێك بن و زار و زمانم ببەستنەوە..

ئەتوانن هەناسەم راگرن و لە هالاٌوێكی رەشم وەردەن..

لیٚ دیسانیشەوە تفێكی تورە دێت  و ئەكەوێتە سەر سینەم و ئەڵێت

دیسانیشەوە گەورە ئەبیت و مەمكت وەكو كوزەرە گوڵێكی مزر ئەدات و حەز ئەكەیت دەستێك لە غەیبەوە بێت و بیقرتێنی

ئەڵێم جا من چوزانم من ماڵی خۆم بۆتە غەیبستان و هەموو شتێكی لیٚ تێكەڵ و پێكەڵ بووە

ئەڵێن ئای نەگبەت چ خەونێکی بەهەشتییانەمان لێ ئەستێنی و تووڕەمان ئەکەیت
ئەڵێم جا من چوزانم ماڵی خۆم بەهەشتێك بوو و سووتا .. جەهەنمێکە وا بە پێوە..
من چوزانم .. من هەموو خۆزگەم .. ماچێك بوو بە سەری پەنجەیەکم بۆ کوڕێکی جیرانی باوێم
من هەموو عەشقم کتێبێك بوو گوڵێکی تیا وشك کەم کە لە عاشقێکی خۆمەوە بە دیاری پێم گەیشتبێت..
هەموو هومێدم وێنەی گەنجێك بوو شەوان بیخەمە ناو سینەم

برایەکم بۆی نووسیبووم
من ئێستاکە هومێدی نیشتمانێك ئەکەم هەر هێندەی مەمکەکانی تۆ گەورەبێت و کەسی ماڵەکەمی نەگاتێ.

ئیدی هەر برایەکە و هیوایەك و خۆزگەیەك لوولی دا..
هەر باوکێکە و رقێك بە شەڕێکەوە مەشغولی کرد..
هەر مێردێکە و بە تەوقێکەوە گیری خوارد..
منیش لە ناو هەموو هیواو خۆزگەکاندا قوربانی بووم
لەناو هەموو شەڕەکاندا ئەکوژرام
لەناو هەموو تەوقەکاندا تفم لێئەکرا..
ئیدی ژیان هەڵاتن بوو لە مەرگێکەوە بۆ مەرگێکی دی..
لە ناو ئەو مەرگانەدا چیرۆکی گەورەبوونم بە خوێن و کوشتنەوە ئەنووسرایەوە
چیرۆکی پیربوونی پیاوەکانیش دیسان هەر بە خوێن و کوشتنەوە ئەنووسرایەوە..

**ئەوەیان بەهەشتی ئێمە بوو .. ئەوەیان بەهەشتی من بوو .. دوای ئەوەی جەهەنەمەکانم لە خۆم توڕە کردبوون**

**ئەوەیان گەورەبوون و ئازادی من بوون .. دوای ئەوەی زنجیرەکانم پسابوون**

**ئەوەیان زەمەنی عەشقی من بوو .. دوای ئەوەی ئەنفال و باخچەی بەهارەکانی کیمیام بەڕێکردبوو**

**ئەوەیان چاکبوونەوەی من بوو ..، دوای ئەوەی زەمەنێك بوو بریندار بووم**

**ئەوەیان هەوای فڕینی من بوو .. دوای شەوە درێژەکانی تاریکیم....**

**ئەوەیان گیرسانەوەی من بوو .. دوای هەڵاتنی بەردەوامم .. لە مردن و لە فەنابوون..**

**ئەوەیان ژیانی من بوو .. دوای ژیان.....**

**ئەبوایە نامەیەك بۆ پیاوەکانیماڵەکەم بنووسم و پێیان بڵێم**

**کەس هەندەی من لە ئێوە دوورنیە و**

**ئێوەش قەت هێندە لە من دوور نەبوون...**

* * * * * *

**بۆ کوێم ئەبەن ..؟ با بمبەن**

**من کە لەروحمەوە نەزیف گرتوومی .. چ باکم بە پەنچە تەزیوەکانم بێت**

**من کە ڕێحانەکەی ناو ئینجانەکەی سەر پەنجەرەی ژوورەکەمیان وردو خاشکرد**

**چ سۆزێکم بۆ دەنگی نووساوم بجوڵێت**

**با بمبەن پیاوە دڵرەقەکانی هەرێمی خوێن و نامووس**

**بۆکوێم ئەبەن؟ پرسیارێکی بێناموسە و بەسەر نامووسی ڕژاوم وەك ڕووبار هاژەی دێ و**

**پیاوەکانیشم پتر تاریك و تاریك ئەکات**

**نازانم ئەوان لە تاریکییەوە هەڵدێن یان لە گوڵ و نێرگز**

له ڕۆحی مێیانه‌ی من بزر ئه‌بن یان له نووته‌كی دیتنه‌كانی خۆیان
ئه‌وان چ سه‌ر شێواوێكن له با خراپتر له گه‌ڵ جوانییه‌كانی كوشتندا فیَ
ئه‌گرن و
وه‌ك چارۆگه‌كه‌ی دایكیشم كه پێش ئه‌نفال هه‌میشه بۆنی مێخه‌كی لیَ ئه‌فڕی
ئێستا ئه‌وانیش چاویان پڕه
له پینه و پنت پنتی سووتان
چ باكم بوو له‌و شه‌وه‌دا كه مانگ پێی ئه‌وتم به‌هاری شازده‌مینت ته‌واو
نه‌كردو
وه‌ك و لافاو ئه‌ڕژێیته‌وه ناو ره‌حمی زه‌وی
تاریكی پێی ئه‌وتم هه‌تاوی به‌یانی له مه‌مكت نادات
بنی سنه‌وبه‌ره‌كه‌ی حه‌وشه كه به‌حاڵ ده‌نگی ئه‌هات پێی گووتم
بڕۆ ئه‌ی به‌ژنی كوژراو ئه‌مشه‌و ئه‌گه‌یته‌وه بالاَی روحی خۆت تۆ كه‌یف
خۆشیت
وه‌ك من نیت كه تازه له چ زه‌مه‌نێكی دیكه‌دا بالاَی سه‌وزم نادۆزمه‌وه
من هه‌ستم ئه‌كرد ئه‌وشۆ له‌گه‌ل دار و بار و باڵنده‌كان ئه‌هاتمه گۆ..
قسه‌م ئه‌كرد و گوێم له ده‌نگیان ئه‌بوو.. هه‌ر هه‌مووشمان خه‌مبار و شتێك له
رۆحمانه‌وه بزر ببو
كه‌ڵه‌شێرێكی دڕمان هه‌بوو ئه‌وشۆ گووتی ئه‌وه ژیانه له رۆحمان بزربووه
كۆتره‌كه‌ی بن ساپیته گووتی ئه‌وه حه‌قیقه‌ته له رۆحمان بزربووه
ئه‌ستێره‌یه‌كیش ئه‌یگووت ئه‌وه هه‌ر هه‌موو شته‌كانن له روحتان بزر ئه‌بن
له‌مشه‌و به‌دواوه ئیدی نه هه‌نارێك لێوتان سوور ئه‌كات و نه سپیندارێك
سیبه‌رتان بۆ ئه‌كات
سرووشت له روحتاندا ئه‌دزریَ و ئیدی بۆن و ره‌نگ بۆ ئه‌به‌د ون ئه‌كه‌ن
ئیدی من فڕینم ونم ئه‌كرد، له ماچه‌كان دائه‌شۆرام و له پێكه‌نین ئه‌كرام و
له ژیان جیا ئه‌كرامه‌وه..

www.dengekan.com
12/8/2006

**لەو دەمەدا قوڵتر لە هەموو ساتێك تێگەیشتم شەڕی براكانی من و پیاوانی من و**
**ماچی كچەكان و ڕێحان چاندن و قسە كردن لەگەل ئەستێرە و سەفەر و كۆچی پیاوەكان و**
**ململانێی زنجیر و دەست .. هزر و ئازادی**
**شیعرەكانی باوكەكانم و نامەی دڵداری كوڕەكان و خەنجەری براكانم ..**
**هەر هەموو ژیان وەك ئەو شەوەی من.. لە مردن .. هەڵئەهاتن**
**لەو لەحزەیەدا من تێگەیشتم عەشق و ئازادی و زنجیر و ئازادی یەك شتن**
**من تێگەیشتم ڕێحان چاندن و كوشتنی من و پیربوونی پیاوەكان**
**موعجیزەیەكن ژیان نیشانی مردنیان ئەدات و مردنیش هەر هەموویان لە ناو خۆیدا هەڵئەگرێت و ئەپێچێتەوە**
**ئیدی نەمئەزانی باكم بە چی بێت بە تاوانەكانی ئەنفال و باخچەكانی هەڵەبجە**
**یان كوشتنی من لە سەردەستی پیاوەكانی ماڵەكەمدا و كە ئەمدی ئەوان بەر لە كوشتنی من لە گەنجییەتیدا،ئەوان لە ڕێی هەلاّتن لە پیریدا ئەمرن..**
**ئەوە ڕێگەی كوشتنی من نەبوو كە پیایدا ئەڕۆیشتین بەقەد ئەوەی ڕێگەی هەلاّتنی ئەوان بوو لە پیری**
**لە پیرییەك كە گومانی ئەخستە باخەڵی هەموو شتێكەوە تەنیا مردن نەبێت..**

**ئازادی لەو شەوەدا ببوە بۆنی مێخەكەكەی سینەی دایكم**
**ببوە ڕێحانەكەی بەر پەنجەرەكەم و فڕین .. كە هەمووشیانم لەو شەوەدا وەك یادگارییەكانی منداڵی ئەبوونە تارمایی..**
**هەموو شتێك ببوە قولاّیی ئەو ساتەی تێگەیشتم ژیانی من و پیاوەكانی ماڵەكەم مردنە مردن ..**

www.dengekan.com
12/8/2006

* * * * *

**برایەکم دوای مردنەکان .. ئەیگوت**
**ئەبوایە تۆ تورە بیت لە من و هەموو براکانی تر**
**تورەبیت وەك شەوبۆیەکی بێناز تورەبیت**
**یان وەك بایەکی هار تورەبیت**
**تورەبیت و ئێمە لە یادەوریی خۆتا بکەیتە رەژوو**
**لە سۆماتا ببینە تاریکی و سووتان**

**لێ تۆ تورە نابیت .. تورە نابیت و بە تورەییت نامانکوژیت**

* * * * * *

**برایەکم دوای شەرەکان ئەیگووت**
**چەند سەختە نە لەباوەشی نیشتمان و نە لەباوەشی ژندا بکوژرێیت**
**چەند سەختە کە ئەزانی ئەکوژرێیت و تەواو .. هەمووشتێك تەواو..**
**تۆش ئەی خوشکە جوانەکەم .. کچێنی و جوانی و ژیانیش لە تۆدا تەواو**
**چەند سەختە تۆ تەواو بیت....**

* * * * *

**باوکێکم هاواری ئەکرد**
**بمبورە بمبورە.. من هەرگیز بە ئازادی تۆم نەکوشت..**

* * * * * *

**دوای مردنەکان ژیانەکان شتێك نەبوو لێی هەڵبێن**
**نە ژیانی من لە پیری و نە ژیانی ئەوان لە فەوتان و نە ژیانی ژیانیش لە فەنابوون**
**دوای مەرگەکان شتێك نەبوو رامانکێشێتەوە سۆمای یەکدی..**

www.dengekan.com
12/8/2006

**شتێك نەبوو بمانباتەوە ماڵەوە.. شتێك نەبوو بمكا بە نیشتمانێك بۆ سەركردەیەك**
**شتێك نەبوو بمكا بە حەوزی ڕێحانێك بۆ باخەوانێك**
**شتێك نەمابوو بمكا بە ئەستێرە و عاشقێك قسەم بۆ بكا ..**
**شتێك نەمابوو بۆی ببمە شۆڕەبی و سێبەر**

**شتێ نەمابوو دانیشێ بەرامبەرم و تەماشای برین و جوانییەكانی كوشتنەكانم بكات..**
**ئای كە سەخت بوو .. لەو بێ شتییەدا .. روحمان نەمابوو تا لەمردن راكات و لە بەرامبەر جوانی كوریكەییێكدا دانیشێ..**
* * * * *
**تاقە ژنێك ..**
**بە شكلی تاقە دارێكی رووتیش نەمابوو..**
**پیرە ژنێك ..**
**بە شێوەی پیرە گۆڕێكیش نەمابوو ..**
**نەمابوو .. نەمابوو ..، هیچ لە رۆحی كچێنی مندا نەمابوو..**
* * * * *
**دارێك بە شێوەی وردە گەڵای وەریویش**
**بەردێك بە شێوەی تۆزیش**
**نەمابوو لە سۆزی نیشتماندا ..**
* * * * * *

**برایەكم ئەیگووت براكانی دیكەم هەندێكیان نیشتمانیان لە تۆدا كوشت و لە نیشتمانیشدا تۆیان كوشت**
**هەندێكیان تۆیان دۆڕاند و هەندێكیش نیشتمان**

لێ من هەم تۆ و هەم نیشتمان و هەم خۆشم کوشت و دۆڕاند.
* * * * * *

دوای کوشتنەکان هەموومان ناونیشانی ماڵ و مەرقەدەکانمان بزر کرد..
کەس نەبوو بڵێ من خوایەکم ئەناسی ناوی نیشتمان بوو
کەس نەبوو بڵێ من خوایەکم ئەپەرست ناوی عەشق بوو
کەس نەبوو بڵێ من لە خوایەك ئەترسام پێیان ئەگووت شەڕ
کەس نەبوو بڵێ من خوایەکم هەبوو پێیان ئەگووت مرۆڤ
کەس نەبوو .. کەس نەبوو .. خوایەکی هەبێت و بیناسێتەوە..
* * * * *

ئیدی دوا شت خواش لە روحم دەرچوو.... برایەکم وایگووت و فیشەکێکی نا بە ئاسمان..
* * * * *

برایەکم ئەیگووتەوە ئەی خوشکەکەم هێشتانەکەش تۆ تورە نیت و تورە نابیت
وەك هیچ شتێ تورە نابیت
* * * * *

نە ئەبوایە من تورە بم
خۆ ئەمزانی نابووتییەکانی من ناگەنە هیچییەکانی پیری ئێوە
من ئەمزانی پیربوونی ئێوە سوڕی سروشتی وەرزەکانی عومر نیە
من ئەمزانی کوشتنی ئێوە حەتمیەتی مێژووی باخچەکانی سێو و سەحرا نیە

**ژیانی من و تەوقەکانی من و ئازارەکانم .. هەمان ڕەنگی چاوی ئێوەیان هەبوو**
**مێیەتی من لە ناو نێرایەتی ئێوەدا بزربووو .. نێرایەتی ئێوەش لە ئەسیری**
**ئازایەتی من لە ناو ئازادنەبوونی ئێوەدا فەنابوو .. و دیتنەکانی ئێوەش لە ترس**
**ئێمە هەموومان ئەترساین .. لە هەڕەشەی تریفەی مانگەشەو نەوەك شەوەکانمان بۆ کەمینەکان ڕووناك کاتەوە..**
**لە تفەنگی نەیارەکان نەوەك لە جیاتی ئەوەی بچێتە سەر سینەی پیاوەکان .. بچێتە ناو مەمکی ئێمەوە**
**هەر هەموومان ئەترساین و لەناو بۆنی باررووتدا ڕێمان تەیئەکرد**
**لە ناو خوێندا گوڵمان ئەچاند و کشتەکی جەمەدانییەکانمان با ئەدان**
**حەزمان لە تەمومژ بوو ..**
**حەزمان لە نیوەشەوی تاریك بوو**
**حەزمان لە ژیان بوو .. ژیانێك کە هەمیشە هەڵاتن نەبێت لە زنجیر**
**هەمیشە ڕاکردن نەبێت لەدەست قەدەر ..**
**هەردەم ڕەڤین نەبێت لە ئایەتەکانی قورئان و ژمارەکانی ئەنفال**
**هەرگیز نووستن نەبێت لە بۆنی سێودا..**
**بۆیە من تورە نابم ..کە لەبەردەم زنجیرەکانی ئێوەدا لە سەگێکیش کەمتر حەپەم نەییَ**
**تورە نابم لەبەر دەستی ئێوەدا .. فیشەك فیشەك بچێتە خانە خانەی نامووس و ئابڕووم**
**تورە نابم لە کوشتنێك کە هەموو ئەنفالەکان و مەرگەکانم لە یادەوەریدا ناسڕێتەوە**
**کە هەموو ناشیرینییەکان و جوانییەکانی مردنم نە بۆ ڕۆشن ئەکات و نە ئەکوژێنێتەوە**

www.dengekan.com
12/8/2006

* * * *

**تورە نابم .. جا تورەش بم بە چی ئەچێت .. کە تورەییم ناتوانێت حەقیقەتێك بکاتە بەر بکوژانم**

**تورە نابم بکوژانم هێشتا لە وەهمێکەمەوە بۆ وەهمێگکی باز ئەدەن..**

**تا ئەو کاتەی بەسەر حەقیقەتێکەوە ئەکەون.. ئا ئەو ساتە تفیٚ هەیە**

**لە کوێوە دیٚ من نازانم .. لیٚ لەو ساتەدا ئەوان تێئەگەن سەردەمیٚ تاوانبار بوون**

**لە کوشتنی من و لە ژیانی مندا تاوانبار بوون**

**لە گەورەبوون و پیربوونی خۆیاندا تاوانبار بوون**

**تێئەگەن ئەکرا من گەورە بم و ئەوانیش پیر بن بە جوانی**

**ئەکرا من عەشق بکەم و ئەوانیش وەنەوشە بچێنن بە میهرەبانی**

**تێئەگەن .. تێئەگەن .. کە کچە گچکە جوانەکان گەورە ئەبن . پیاوەکان پیر ئەبن**

**پیر ئەبن و ئەبێت قبوڵیان بێت کە پیر ئەبن .. وەك پیر ئەبن......**

12/8/2006

لە نێوان مانگ و ئەستێرەکاندا

خۆشەویستییەك هەیە بێ سنوور

* * * * *

لە نێوان گوڵ و پەپوولەکاندا

سۆزێك هەیە بێ کۆتایی



* * * * *

لە نێوان شەو و ماچدا

هەزاران مرۆڤ

* * * * * *

لە نێوان من و خوادا

جیاوازی بێ مەودا

* * * * * *

لە نێوان فریشتە و بادا

چەندین ئاواز

* * * * * *

لە نێوان هەور و گیادا

گریانی باران

* * * * *

www.dengekan.com
12/8/2006

**لەنێوان  مێخەك و مەمكدا**

**دەسكێك بۆن هەیە**

* * * * * *

**لە نێوان دارستان و كتێبدا**

**فەنەری خەیاڵ**

* * * * * *

**لەنێوان شعر و مامزدا**

**روحێك**

* * * * * *

**جیاوازی شەو و پیاو**

**ئنجانەیەكە**

* * * * * *

**جیاوازی دەریا و شوان**

**مێگەڵێكە**

* * * * * *

**جیاوازی خوا و باران**

**هەورێكە**

* * * * * *

**جیاوازی كانی و پەنجەرە**

**تریفەیەكە**

www.dengekan.com
12/8/2006

**پەیمانێك**

* * * * * * *



**لە نێوان مێروولە و گەنمدا**
**هەزاران پیلان**

* * * * * * *

**لە نێوان زمان و نووسیندا**
**دیرۆکێك لە ئاماژە**

* * * * * * *

**لە نێوان مردن و ژیانەوەدا**
**کتێبی باوەڕ**

* * * * * * *

**لە نێوان کۆمپیوتەر و پەنجەکانم**
**ڕوح**

* * * * * * *

**لە نێوان دۆزەخ و دەنگم**
**ئازادی**



* * * * * * * *

**جیاوازی ژن و فریشتە**

www.dengekan.com
12/8/2006

**دەسماڵێک**

*** * * * * * ***



**جیاوازی رۆح و جەستە**

**فڕین**

*** * * * * * ***

**لەنێوانی ئاگر و خەیاڵدا**

**داگیرسان و درەوشانەوە**

**** * * * * ***

**لەنێوان نووستن و نووسیندا**

**خەفەبوون**

**** * * * * ***

**لە نێوان سەفەر و گیرسانەوەدا**

**جانتا**

*** * * * * * ***

**لە نێوان سەما و گریاندا**

**فرمێسک**

*** * * * * ***

**لە نێوان ئاسمان و ئازادیدا**

www.dengekan.com
12/8/2006

* * * * * * *



**له نێوان ڕەنگ و مناڵیدا**

**یادگارییەكانی پەلكەزێڕینە**

* * * * * * *

**لەنێوان مەم و زین و لاس و خەزال و خەج و سیابەنددا**

**بەكر و تیر و نێری**

* * * * * * *

**له نێوان چاو و برۆدا**

**سێبەر**

** * * * *

**له نێوان سمێڵ و كەپوودا**

**موس**




* * * * * * *

**له نێوان پەنجە و دەستدا**

**دونیایەك عاتیفە**

* * * * * * *

**لەنێوان دڵ و خوێندا**

**هەمیشە سەفەر**

www.dengekan.com
12/8/2006

* * * * * *



**جیاوازی مۆم و قەڵەم**

**چرا**

** * * * * * *

**لەنێوان کچێنی و ژنایەتیدا**

**خوێن**

*** * * * *

**لەنێوان چیرۆك و هەقایەتدا**

**پاڵەوان**

* * * * * * * *

**لەنێوان نیشتمان و خۆشەویستیدا**

**بەرگری**

* * * * * * *

**لەنێوان دار و پەلکەکاندا**

**بۆنی با**

* * * * * * *

**هاژە دەنگی پێی جۆگەیە**

* * * * * *

**خشپە دەنگی پەنجەکانی گەڵایە**

مرچ دەنگی سەفەری لێوە

** * * * * *

ئاوزینگ دەنگی قەیتان گرێدانی گیانە

* * * * * * *

لێستنەوە

ئازادی زمانە لە تەنهایی

* * * * * * *

خوران

خزمەتی پەنجەکانە

* * * * * * *

روناکی

تورەکردنی تاریکییە

** * * * * *

چرا کوژاندنەوە

ئاشتکردنەوەی تاریکییە

* * * * * *

نووسین لە سەر وورد

تورەکردنی پێنووسە

www.dengekan.com
12/8/2006

* * * * * *

مەسیجەکانی مۆبایل
کوشتنی خەت

* * * * * * *

قسە کرن بە ئەنتەرنێت
بێنازکردنی نامە



* * * * * * *

چەتینگ
مەرگی پیاسە

* * * * * * *

پرنتینگ
کوشتنی سکرینە

* * * * * * *

سپلێت
نەفرەتە لە هەوای ژوور

** * * * * *

جگەرەکێشان

www.dengekan.com
12/8/2006



**فەنابوونی توتنە لە دوکەڵدا**

* * * * * * *

**کتێب**

**سووتانی دەستنووسە**

* * * * * * *

**خەتخەتانێ**

**عەشقی بەردە بۆ هێڵەکان و رقی منداڵە لە بەیەکگەیشتن**

* * * * * * * *

**کەلایانێ**

**خەباتی کەلایە بۆ ئازار نەدانی توخمی خۆی و سەرڕەقی مرۆڤە بۆ پێکدادان**

* * * * * * *

**بلیارد**

**هەوڵی ژمارەکانە بۆ خۆبەدەستەوەنەدان و یاری پیاوەکانە بۆ سەرکەوتن**

* * * * * *

**پێنجوکانێ**

**شەڕی بەردەکانە بۆ سەربەستی و حەزی پەنجەکانە بۆ ئازاردانییان**

* * * * * * *

پێنگ پۆنگ و تێنس و فۆتبۆل
ئەشکەنجەی بەنی تۆپە

* * * * * * *

پێناسە
کوشتنی ماناکانە

* * * * * * *

ناو
زیندانی مرۆڤە

* * * * * * *

رشانەوە
یاخیبوونی جەستەیە لە خواردن

* * * * *

منداڵ لەبەر چوون
رازینەبوونی رەحمە

* * * * * *

لە نێوان دیوار و پەنجەرە و دەرگاکاندا
رقێك هەیە بێ ئەندازە

* * * * * * *

لە نێوان باخچە و گوڵدا

www.dengekan.com
12/8/2006

**مەسافەیەك هەیە پڕ لە شەڕ**



*** * * * * ***

**لە نێوان هەر گوڵێك و گوڵێكدا**

**باخچەیەك ناشرینی**

*** * * * * ***

**لە نێوان سویچ و چرادا**

**خراپترین پەیوەندی**

**** * * * * ***

**لە نێوان حەرفەكانی كیبۆرددا**

**تەماشای بێ شوماری ناشرین**

*** * * * * ***

**لە نێوان جگەرەكانی پاكەتێكدا**

**بۆنی قین**



*** * * * * * ***

**لە نێوان دوو شعردا**

**پەیوەندییەكی بۆگەنی**

**** * * * * ***

**لە نێوان كلیل و قفڵدا**

**ئازاری بەردەوام**

* * * * * * *

له نێوان نەوت و فتیله و شقارتەدا

هەمیشه دوژمنداری

* * * * * * *

له نێوان زستان و سۆبه

بەردەوام نەیاری

* * * * * * *

له نێوان بەهار و گیادا

کوشندەترین ئێواره

** * * * * *

له نێوان ژیان و مردندا

عەشقێك بۆ ئەبەد

* * * * * * *

گزنگ

سەر له کازێوه ئەشێوێنیٚ

* * * * * *

تریفه پیلانەکانی تاریکی تێك ئەدات

* * * * * *



www.dengekan.com
12/8/2006

**هەتاو نایەڵێت**

**زەمەن شەوچەرەکەی تەواو کات**

*** * * * * ***

**وێنە بارگرانیە بەسەر دیواردا**

*** * * * * * ***

**جگەرە بێ سۆزە بەرامبەر بە تەپلەکدا**

**قاوە بەرامبەر بە فنجاندا**

*** * * * ***

**تۆمۆبێل لە وەرگەڕاندا ئازادە**

*** * * * * * ***

**شۆرتی کارەبا ساتی درەوشانەوەی وزە و خۆکوشتنی گڵۆپ و گۆڕینەوەی ژیانی ئامێرەکانە بە مردن**

*** * * * * ***

**هەور بێزارە لەوەی هەردەم ببێتە بەفر و باران**

*** * * * * ***



**پەپوولە لە هاوڕێیەتی گوڵ ماندوو بووە**

*** * * * * * ***

**مێش هیواخوازی عیلاقەیەکی باشە لەگەل مرۆڤ**

www.dengekan.com
12/8/2006

* * * * * * *

سەگە تۆڕییەکان هێشتا یاخین

* * * * * *

کۆترە کێوییەکان لە وانی دی بەشەڕەفترن

* * * * * *

هۆڵ داخلی

چاوێکی لەسەر ژووری مێوانانە و چاوێکی لەسەر ژووری نووستن

* * * * * * *

جیاوازی پیاو و کوڕ

خۆشەویستی سۆزانییەکان

* * * * * * *



سۆزانی

پڕە لە چێژ و ئابڕوو

* * * * * *

ژووری نووستن

جەهەنەمی پیاو

* * * * * * * *

دەریا و کەنار

www.dengekan.com
12/8/2006

ئەزیەت کۆتیان ئەکات و ئازاریش جیایان ئەکاتەوە

نە لەناو یەك فەنا ئەبن نە لەیەکیش دەرباز ئەبن



* * * * * * * *

با ئەباریٚ

ریٚحانیٚك هەناسە ئەچیٚنیٚ

** * * * * * *

پیٚلاٚویٚك عاشقی گۆرەوییەکی بۆرە

* * * * * * *

دکتۆرەکان با ش لە مەرگ ناگەن

* * * * * *

عەشق

روو لە مردن ناکات

* * * * * *

بەهەشت

سویٚبوونەوەیە لە ژیان

* * * * * * *

سیٚوەکانی باخەلٚم

لە هەنارەکانی تۆ خانە خانە ترن



www.dengekan.com
12/8/2006

* * * * *

من وەحشم لە تۆی پەریدا

* ** * * * *

هەناسەکانی ڕێحان تێکەڵ بە نامەکانی هەتاو ئەبن* * * * * * *
نامە نووسین
جوانییەکە لە جوانییەکانی شەنگە بی ئەکا

* * * * * * *

خوێندنەوە
دانیشتنە لەبەر سێبەری وەنەوشە

* * * * * **

نووسین
خەمخواردنە لە گەیشتنی چۆلەکەکان بە هێلانەکانیان

** * * * * *

خەمخواردن
پێشکەیەکە بە دڵ وە ئەدات

* * * * * *

پێشکە

www.dengekan.com
12/8/2006

**ئەیویٚ تێکەڵی خوێنی مرۆڤ بیٚ لە خۆشەویستیدا**

** * * * * * * *

**لە خۆشەویستیدا**

**دەفتەر و نامە و گوڵ و چرا و وەك ماچ خۆشن**

** * * * * * * *

**دیارییەكانی یەكەم خۆشەویست و دواهەمین خۆشەویست**

**هەناسەی نیرگزن**

** * * * * * * *

**فلۆپی**

**خەونەكانیش ئەگوازێتەوە**

** * * * * * * *

**تەپلەی جگەرە**

**عەشقێك بۆ بۆن و تۆزی یارە سووتاوەكەی**

** * * * * * * *

**شانۆ**

**گریانێك بۆ دووری و لەدەست چوونێكی جوانی**

** * * * * * * * *



**مێلاقەكانی هەنار**

**تلوڤەی حەزە وشكبووەكانی باخچە**

